پەیامەکانی گەنجان ٣٣

زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان ٨




# گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ

فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ

نوسینی: مصطفی محمود

وەرگێڕانی :موحەممەد مەلا صاڵح شارەزووری

پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان


# گەشتەکەم

## لە گومانەوە بۆ باوەڕ

نوسینی : موستەفا مەحمود
وەرگێڕانی :
مامۆستا موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری

زنجیرە پەیامەکانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە ( ٣٣ )

📖 ناوی کتێب: گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ
✍ نوسینی: موستەفا مەحمود
🖋 وەرگێڕانی: موحەممەد صاڵح ئەبوبکر شارەزووری
* ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان
* ژمارەی زنجیرە: ٨
* تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
* نۆبەی چاپ: دووەم
* ساڵی چاپ: ٢٠١٥
* ژمارەی لاپەڕە : ١٣٣ لاپەڕە
* دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن
* پێداچونەوەی: کۆچەر محمد مەلا صالح
* چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ
* نرخ : تەنها (٣٥٠٠) دینار
* سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد
* ئیمەیل: renwen2009@yahoo.com
* ماڵپەڕ: www.aubyc.com
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٩٣)ی
ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە

## ـ پێشەکی :

پێشینان وتوویانە: (سەد حەکیم بە قەد دەردەدارێك نازانێ) ئەمە زۆر جوان و ڕاستە.

ئادەمیزاد خۆی ڕێگای گومان و دوودڵی تاقیدەکاتەوەو بیروباوەڕی شەن و کەو نەکات و پوختە تەتەڵەی نەکات، هەر نانێکی کردەوەی لێبکات، بێ پێز دەرئەچێت و بە کەڵکی خواردن نایەت .

هەزاران مەلا باسی ماددیەت بکەن و بەراوردی بکەن لەگەڵ بیروڕای ئیسلامدا و هەزاران بەڵگەی جۆر بە جۆر بهێننەوە . با فەرموودەکانیشیان ڕاست بێت . تامی ئەوە نادات، یەکێك لەو شارەوە هاتبێتەوە و پرسیارێکی لێ بکرێت.

هەر بەو نیازەوە زۆر گەڕام بە دوای یەکێکدا کە سەرێکی لەم شارە دابێت گەرچی شەویشی تێدا بەسەر نەبردبێت، تاکو هەندێ باسی ژیانی ڕاستەقینەی ئەو شارەم بۆ بکات. "بەڵام ئەوەی کە لە وڵاتی ئێمەدا ڕێی گرتبێتە بەر بۆ (شاری باوەڕ بە مادەو بەس) یان هەر لە دوورەوە کە چزو هۆڕی هەڵچرقاندنی هۆش و باوەڕی بەر لوت کەوتووە، ئیتر گەڕاوەتەوەو نەچۆتە ناو شار، یان هەر لە نوختەی پشکنینی شار، چەکی هۆشی لێ داڕنی و دەرزییەکی بەنجیان لێداو کردیانە ناو شارەکەوە".

بەڵام کاتێ بۆ یەکەم جار کتێبی (رحلتي من الشك إلى الإيمان)م خوێندەوە بۆم دەرکەوت کە (مصطفى محمود) زۆر بلیمەتانە توانیویەتی لە لاڕێ‌و پشت نوختەی داڕنینی هۆش خۆی بدزێتەوەو بچێتە ناو ئەم شارەوە، نەك چەند ڕۆژێك، بەڵکو تەمەنێکی زۆری تێدا بەسەر بردووەو بە هۆی هۆشەوە کە فیشەکی زانیاری دەخوات بەربەرکانێی لەگەڵ هەموو چەتەکان‌و قۆڵ بڕەکانی ناو شار بکات‌و بەسەریشیاندا زاڵ بێت.

بەڵێ، بەسەرهاتەکەی بە تەواوی سەرنجی ڕاکێشام، بۆیە دەستم دایە خامە، کە بیگۆڕمە سەر زمانە خۆشەویستەکەی خۆم زمانی (کوردی)، پاش ئەوەی لە وەرگێڕانی بومەوە، بە هۆی (دار الشروق)ەوە لە قاهیرە، نامەیەکم بۆ دکتۆر (مصطفى) نارد، ئەویش وەڵامی نامەکەمی بەم جۆرە دایەوە، وا نامەکەی لێرەدا بە کوردی دەنوسمەوە بۆ ئەوەی زیاتر دانەر بناسین.

- نامەکە :

برای خۆشەویستم (موحەممەد مەلا سالح) پاش سلاو، نامەکەت کە بە هۆی (دار الشروق) لە (قاهیرە) ناردبوت بە دەستم گەیشت ویستبوت کە هەندێ لە مێژووی ژیانم بزانیت، تاکو لە سەرەتایی وەرگێڕانەکەتدا بینوسیت، سوپاست دەکەم، بۆ ئاگاداریت هیوام وایە ئەم نوسراوە کورتەی خوارەوە بۆ سەرەتای نووسراوەکەت بشێت:

نووسەر ناوی (مصطفی کەمال مەحمود حسێن)ە، لە ڕۆژی (١٩٢١/١٢/٢٥) لە (شبین الطوم) کە شارێکی بچووکە لەسەر ڕووی دەریا لە میسر لە دایك بووە، پاش چەند مانگێك ماڵیان چووە بۆ (طنطا)، لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی تەواو کردووە. لە دواییدا چووە بۆ (قاهیرە)، لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٢ زانکۆی تەواو کردو بوو بە پزیشك.

ماوەی حەوت ساڵ پزیشك بوو لە بەشی نەخۆشییەکانی سنگدا، لە ساڵی (١٩٦٠) وازی لە پزیشکی هێناو دەستیکرد بە نووسین.

لەو کاتەوە دەستیکردوە بە نوسینی وێژەوانی وەکو هەڵبەست و کورتە چیرۆك، بەڵام هیچیانی بڵاونەکردۆتەوە، تا ساڵی (١٩٤٧) کە لە گۆڤاری (الرسالة)دا یەکەم چیرۆکی لەژێر

ناونیشـانی (الهـواجس)دا بڵاوكـردەوە، ئـیتر دەسـتیكرد بـە بڵاوكردنـەوەی بەرهەمـەكانی لـە ڕۆژنامـەو گۆڤـاری (المصـري، أخبار اليوم، آخر الساعة، كتب للجميع، التحرير، روز اليوسف، صـباح الخـير)دا، ئێسـتاش لەسـەر نووسـين بەردەوامـە. لـەو ماوەيـەدا (٣٥) بەرهـەمی جۆربـەجۆری لـە كورتـە چـيرۆك و شانۆگەری و لێكۆڵینەوەی دەرچووە.

## ـ بەرهەمە ئیسلامییەکانی:

یەکەم کتێبی (الله والإنسان) بوو کە بە تەواوی هێرشی کردۆتە سەر ئایین و گاڵتەی بەوە کردووە، کە ئایین هێناویەتی وەکو نادیار (غەیب) و (موعجیزەو خەواریق)، زیاتر بۆنی بیروباوەڕی (.....) و مادییەتی لێوە دەهات، کاتێ ئەم کتێبە دەرچوو بە فەرمانی دادگا بڵاوکردنەوەی قەدەغە کرا.

بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا گۆڕانێکی بیروباوەڕی بەسەردا هات و بۆی دەرکەوت کە زانست ناتوانێت هەموو شتێك شیتەڵ بکات، چونکە بەشی زانست دیاریکراوە لە چەندایەتی و ئەم پەیوەندییە ئاشکرایەی کە لە نێوان ماددەکاندا هەیەو دانانی یاسا بۆ جموجۆڵیانە، ئیتر ناتوانێت ئەوپەڕی ڕاستی هیچ شتێك بزانێت.

دیسان زانست خۆی لە غەیبدا چەقیوە، چونکە ئەو باسی کارەباو موگناتیس و کێشەر (جاذبیة) دەکات، بێنەوەی بێجگە لەو شوێنەوارە هیچیانی لێ ببینێت، باسی ئەلیکترۆن دەکات بێنەوەی چاوی پێ بکەوێت.

بەڵکو بەر هەستی دەکەوێت و بەس، ئیتر زانست مافی ئەوەی نییە تانە لە نادیار (غیب) بدات، لە کتێبەکانی (المستحیل، لغز الموت، لغز الحیاة، العنکبوت، الخروج من التابوت)و (رحلتي من

الشـك إلى الإيمـان)دا بـاوەڕی ئەچـەرخێنێ لـە زانیارییـەكی مادییەوە بۆ فەلسەفە، بۆ ئایین، لە پاشدا لە كتێبەكەیدا بە ناوی (القرآن محاولة لفهم عصري) باوەڕی ئاشكرا دەكات، كە (هەر ئیسلامە دەتوانێت هەموو گیروگرفتێك چارەسەر بكات، زیاتر لە زانستی هەموو زانایەك‌و فەلسەفەی هەموو فەیلەسوفێك ).

لە ساڵی (١٩٦٢)دا ژنی هێناوەو دوو كوڕی هەیە.

جا داواكارم هەر كە نوسراوەكەت چاپ كرد چەند دانەیەكم بۆ بنێریت بەم ناونیشانەی خوارەوە:

الدكتور مصطفى محمود

١٠٢ شارع النيل شقة ٧٢ القاهرة

ئیتر سڵاوو خۆشەویستیم پێشكەشتە.

ئێمەش با دەست بكەین بە خوێندنەوەی گەشتەكەی..

موحەممەد مەلا ساڵح شارەزووری

گوركەدەری شارباژێڕ

١٩٧٤/٤/٤ز

**ـ خوا ( الله ) :**

ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر بە تەواوی نایەتەوە بیرم، تازە لە پلەکانی سیانزەو چواردە ساڵی تەمەنم سەردەکەوتم و بەرەو باڵق بون دەچووم، وردە وردە بەرەو ڕێگای یاخیبون دەچووم و بێپەروا ئەم پرسیارانەم بە دەمدا ئەهات:

ئێوە دەڵێن خوا دونیای دروستکردووە. چونکە پێویستە هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەری هەبێ و هەموو هەبوویەك داهێنەری هەبێت.

بەڵێ ڕاستەو باوەڕمان هەیە، بەڵام پێم بڵێن ئەی کێ خوای دروستکردووە ؟

یان هەر لە خۆیەوە هاتووەو بووە، ئەگەر وا دەڵێن و بەلاتانەوە ڕاستە، ئەی بۆ ڕاست نەبێ کە دنیا هەر لە خۆیەوە بووبێت بەبێ بەدیهێنەرو بە کورتی ببڕێتەوەو کۆتایی بەم کێشەیە بهێنین.

کە ئەمانەم دەوت دەمو چاوەکانی دەوروبەرم زەرد هەڵئەگەڕان و زمانەکان بارانی جنێویان بەسەردا دەباراندم و بۆ لێدانم لە ڕاست و چەپەوە مشتەکۆڵەکان پێشبڕکێکییان بوو، تەنیا پیاوە باشە دڵ نەرمەکان بۆم دەپاڕانەوە، کە لەم یاخیبونە ڕزگارم ببێت و خوا ڕێگەی ڕاستم نیشان بدات، پیاوە بەڕێزو

سەنگینەکان لێم دوورکەوتنەوە، یاخیبووەکان لێم کۆدەبونەوە، ئەوکاتەش پێکەوە لە دەماقاڵەیەکدا نقووم دەبووین کە کۆتایی نابێ، مەگەر دەست پێبکرێتەوە دەستیش پێ ناکرێ هەتا بە شێنەیی و لەسەرخۆیی دەمەقاڵەکە نەکرێ.

لەو ڕۆژانەوە بە هۆی ئەم شەڕە وتانەوە، ڕاستیم لێ ون بوو، وردە وردە هۆشم پەیدا کردو فێری قسە کردن بووم، حەزم لە ڕازانەوەی وتەو وشە دەکرد، ئەمەش بوو بە هۆی پاڵ پێوە نانم بۆ یاخیبون و هانی دەدام.

وتەکانم بۆ دۆزینەوەی ڕاستی نەبوو، بۆ ڕاستی نەبوو، بەڵێ بەمجۆرە لە خوا یاخیبوم و پشتم لە فەرمانەکانی کرد و دەستم کرد بە پەرستنی خۆم، چونکە زۆر دڵخۆش بووم بەو تروسکایی ڕۆشنبیرییەم بە شوێن چەڕە دوکەڵی ئارەزوومدا دەڕۆیشتم، ئەم هەستە هەموو ڕۆژێك تازە دەبویەوە، هەتا چۆنێتی وتوێژم لە بیرچویەوە، بوومە دوژمنی خۆشم، دەمویست بە زۆر بە خۆم بڵێم خوا هەیە، کەچی دڵم، دڵی کرمۆڵم پێی دەوتم ئاخر کێ خوای دروستکردوە ؟

بەڵام هەر پێویستە یەکەم کەسێ هەبێ، کە دروستکەر بێ و هەر خۆی لە خۆیدا بوبێت، بۆ دروستکردنی خۆی و دروستکراوەکانی پێویستی بە کەس نەبوبێ.

ئەگەر ئەمیش یەکێ دروستی کردبێ، یەکێکی تر ئەمی دروست کردبێ، تا دەڕوات، ئەمە دەبێت بە زنجیرە دروستکراوێك هەتا بڕوات یەکەم دروستکەر نادۆزرێتەوە، ئەمەش نابێت و ناگونجێت، ئەمەش ڕەهەندی ئەو کێشە فەلسەفییەیە کە (ئەرستۆ)[1] بڵێت: (هۆی یەکەم و خولدەری یەکەمی ئەم گەردونە دەبێ هەبێت)، بەڵام ئەو کات ئەم ڕەهەندانە لە بیرو زیهنمدا ڕون نەبوو، هەروا (ئەرستۆ)و وتەکانیم بە تەواوی نەدەناسی و نەمدەزانی یاسا بەراییەکانی ژیربێژی و دەمەقاڵێ (جدل) چییە ؟

لەم دۆخەدا مامەوە تا ماوەی (٣٠) ساڵێك، کە ون بوو بووم لە ژێر خوێندنەوەی پەرتووك و هەزاران شەوی تەنیایی و گۆشەنشینی بۆ خوێندنەوەو بیرکردنەوەو وتوێژ لەگەڵ خۆمدا دوپاتکردنەوەی بەستن و هەڵوەشانەوەی هەزاران جۆرە بیروڕا، دیسان بیری خۆمم گۆڕی بۆ بڕینی ئەو ڕێگە پڕ لە دڕکە لە نێوان (خواو مرۆڤدا)[2] بۆ هەڵهێنانی (مەتەڵی ژیان و مەتەڵی مردن)[3]

---

[1] ئەرستۆ: مامۆستای ئەسکەندەرو فەیلەسوفی یۆنانییە، زۆر دانراوی لە ژیربێژی (منطق)و سروشتگەری (طبیعیات)دا هەیە.

[2] خواو مرۆڤ (الله والانسان) یەکەم دانراوی (مصطفی محمود)ە، لەم کتێبەدا بە تەواوی دەریخستووە کە بیروباوەڕی بە بوونی خوا نییە.

و بەسەرهاتمان پاش مردن، تاکو بتوانم ئەمە بە دڵێکی پڕ لە باوەڕەوە بنووسم، بەڵام نەك بە ئاسانی، چونکە فێر نەبوو بووم بە ئاسانی ڕاستی وەربگرم.

جا ئەگەر من گوێم بگرتایە لە دەنگی سروشت (فطرة)مو بیرم بکردبایەوە، ئەوا خۆم لە کوێرەوەری دەمەقاڵی ڕزگار دەکردو دەیگەیاندمە لای خوا، بەڵام من لە کاتێکدا دەژیم، کە هەموو شتێکی تێدا ئاڵۆزەو دەنگی فیترەتی تێدا کزە، هەتا وای لێهاتووە بووە بە چرپە، دەنگی ژیریش زاڵ بووەو بۆتە ژاوەژاو. عەقڵ لە زێدەڕۆیی کردنی لێی ناگیرێ، چونکە ئەویش یاخی بوو بوو، پێی زیاد ڕاکێشابوو، خۆی وا دەبینی ئەو پیشەسازی کارەبا، ڕۆکێت، فڕۆکەی بە شارستانێتی بەخشیوە، خۆی دەبیینی لوتی داوە لە ئاسمان و بنی دەریا، ئیتر وای دەزانی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، خۆی فڕێ دەدایە هەموو شتێکەوە، خۆیشی دەکرد بە دادوەر بەسەر هەرشتێ، بیزانێ یا نەیزانێ.

---

[٣] مەتەڵی ژیان، مەتەڵی مردن (لغز الحياة، لغز الموت) دوو دانراوی (مصطفى محمود)ن.

كاتی منداڵیم، لە كتێبخانەی شارەوانی لە (طنطا)[٤] خۆم كردبوو بە ژێر كتێبەوە، وتەكانی (شمیل)و (سلامە موسا)[٥]م دەخوێندەوە تا (فرۆید)[٦] و (داروین)[٧] بناسم.

بە كیمیاو سروشتگەری (الطبیعة)و بایۆلۆجییەوە خۆم خەریك دەكرد، لە ماڵەوەشدا كارگەیەكی بچووكم هەبوو، كە تێیدا خەریكی دەرهێنانی كاربۆن و دووەم ئۆكسیدی گۆگرد بووم و (سیسركە)م بە كلۆر دەكوشت و لاشەی (بۆق)م توێكار (تشریح) دەكرد.

چونكە هاوارێك هەبوو هەموو جیهانی گرتبووەوە، كە ئەویش زانست بوو، زانست، زانست، هەر زانست.

دیدی بابەتیانە (النظرة الموضوعیة) تاكە ڕێگەیە.

ئیتر با واز لە نادیارییەكان (الغیبیات) بهێنین و بەس بخورد بسوتێنین و شتی پڕوپوچ كاوێژ بكەینەوەو دوای ئەفسانە بكەوین.

---

[٤] طنطا: شارێكی گەورەی میسرەو جەمسەری هەموو هێڵی ئاسنینە.

[٥] سەلامە موسا: یەكێكە لە ئەدیبەكانی قبتی لە میسر، لە لەندەن و پاریس خوێندوویەتی و خاوەنی كتێبی (الانسان قیمة التطور)ە.

[٦] فرۆید: فەیلەسوفێكی نەمساویەو داهێنەری ڕێگەی شیتەڵ كردنەوەی ئەفسانەییە.

[٧] داروین: زانایەكی ئینگلیزییە خاوەنی بیردۆزەی (النشوء والإرتقاء)ە.

دەموت کێ فڕۆکە و تانك (دبابة)مان دەداتێ و ئایین و پەرستنەکانمان لێ وەردەگرێ ؟

هەواڵەکانی زانستی ڕۆژئاوایی، کە بە ئێمە دەگەیشت سەرسوڕهێنەر بوو، ئاوی چاومان پێی دادەهات، ئێمە هەموو شتێکمان لە ڕۆژئاوا وەردەگرت، پەرتوك، داودەرمان، شەمەندەفەر، ئۆتۆمبیل، خواردنی ناو قوتو، پێنووس، دەرزی، شێوازی داڕشتنی ئەدەبی و وێژەوانی، لە چیرۆك و شانۆگەری و پەخشان، تەنانەت کاغەزی دەرکردنی ڕۆژنامەش، لە باسی پاڵەوانەکانی ڕۆژئاواو پیتۆڵەکانی، خەوی خۆمان دەزڕان و سەرمەشق لە (باستێر)[٨] (مارکۆنی)[٩] و (ڕۆنتگن)[١٠] و (ئەدیسۆن)[١١] یان (ناپلیۆن)[١٢] و (ئەبراهام لنکۆڵن) و (کریستۆڤەر کۆلۆمبس)[١٣] و (ماجەلان)[١٤] مان دەکردنە نمونەی بەرزمان.

---

[٨] باستێر: زانایەکی فەرەنسی بوو دەرمانی نەخۆشی سەگی دۆزییەوە.

[٩] مارکۆنی: زانایەکی ئیتالییە و داهێنەری بێ تەل (لاسلکی)و رادیۆیە.

[١٠] ڕۆنتگن: زانایەگی ئەڵمانی بوو داهێنەری تیشك (اشعە)یە.

[١١] ئەدیسۆن: زانایەکی ئەمریکییە و داهێنەری کارەباو کامێرا و قەوان بوو.

[١٢] ناپلیۆن: پاشای فەرەنسا بوو هێرشی هێنایە سەر میسر (١٧٩٨ز).

[١٣] کریستۆڤەر کۆلۆمبۆس: دەریاوانی ئیتالی بوو ئەمریکای دۆزییەوە.

[١٤] ماجەلان: دەریاوانی پرتوگالی بوو هەوڵی گەشتێکی سەر زەوی دا، بەڵام لە فلیپین کوژرا.

بە کورتی هەر ئەوان پێشکەوتوو بوون، بەڵام ئێمە دواکەوتوین و بێ هێزین و لە ژێر پێی داگیرکەرانا داتەپیوین.

بەڵێ وامان دەزانی هەر شتێك لەلای ئەوانەوە بێت ڕوناکی و ڕاستییەو تاکە ڕێگاچارەی هێزو ڕزگاربونە.

لە پاشدا چومە کۆلیجی پزیشکی تاکو زانستەکان بە زمانی ئینگلیزی بخوێنم و لە سەرچاوە ئینگلیزییەکان توێکاری (تشریح) بخوێنم، هەروا لە نەخۆشخانە بە زمانی ئینگلیزی قسە لەگەڵ مامۆستاکانم بکەم، ئەمە بەس لەبەرئەوە نەبوو کە نۆکەندی (سوێس) ئینگلیز داگیری کردبوو. بەڵکو لەبەر هۆیەکی ڕەوا و ڕاستر بوو، کە ئەویش ئەوەبوو زانستی پزیشکی نوێ بە تەواوی پیشەو دەستکردی ڕۆژئاوایی بوو، ئەو هەوڵەی لە کاتی (ابن سینا)و هاوەڵەکانیدا دراوە سەرەتا بووەو دەوای دەردی ئێستا ناکات.

بەڵێ، ڕۆژئاواییەکان دەستیان بە گوریسەکەوە گرت، کە بە (ابن سینا)[15] و توێژەرە موسڵمانەکان کۆتاییان هات، ئینجا ئەوان بە توانستی پێشکەوتوەوە دەستیان پێکردەوە، ئەویش بە هێنانی کارگەی گەورەو تاقیکردنەوەو تەرخانکردنی هەزاران

---

[15] ابن سینا: زانایەکی پایەبەرزی ئیسلامە لە ساڵی ٩٨٠ز لە بخارا لە دایك بووەو لە ساڵی ١٠٣٧ز لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە.

ملیۆن دینار بۆ لێکۆڵینەوە، تاکو توانییان پێش پێشووەکان بکەونەوە، چ لە موسڵمانو چ لە نەتەوەکانی تر، کۆشکو تەلاری زانستی پزیشکی نوێو فسیۆلۆژیاو توێکاریو بایۆلۆجییایان بەرپا کرد، تاکو بە ڕاستی بون بە سەرچاوە.

لە کتێبە پزیشکییەکاندا فێری ئەوە بووم کە هەموو شتێك بە گەزو ترازووی زانستی بپێومو بکێشم، ئەوەی بینراو هاتە ژێر میکرۆسکۆبەوە هەیەو ڕاستە ئەوەش وانەبوو، نییە.

زانست خۆی لە بینراوو هەست پێکراوو دەست لێدراوو (المنظر والمحسوس والملموس) دەست پێدەکات.

خودی زانست بریتییە لە کردەی کۆکردنەوەی چەند بینراوێكو دەرهێنانی چەند یاسایەك.

ئەوەی هەستی پێ نەکرێت لە دیدی زانستییەوە مانای نەبونە.

نادیار (غیب) لە یاسای زانستیدا حسابی نییە.

ئا بەم جۆرە گەڕانەکەم دەستپێکرد، بە هۆشێکی زانستی ماددی لە جیهانی بیروبڕواوە، سەرەڕای ئەم زەمینە مادییە و ئەو شتە هەست پێکراوانەی کە نکوڵیی لە نادیار دەکەن، نەمتوانی هێزی خوایی بەلاوە بنێم و نەرێی لێ بکەم.

بەڵام وەنەبێ زانست وازی لێ هێنابم و هێشتبێتی لەسەر یەك بار بمێنمەوە، چونکە هەموو ڕۆژێك جوانترین وێنەی ئەم بونەوەرەی نیشان دەدام.

هەموو شتێك، هەر لە (گەڵای دار، باڵی پەپولە، زیخ و چەو) ڕێکوپێکی و جوانی یاسای تێدایە.

بونەوەر هەمووی بە ئەندازەو چەند یاسایەکی زۆر ورد دانراوە.

هەموو شتێك بە یاسا دەجولێتەوە هەر لە وردترین شت لەم بونەوەرەدا هەتا ئاسمانی گەورەو خۆرو ئەستێرەکانی تر، کە ژمارەیان لە هەزار ملیۆن خۆر زیاترن، ئەو گەردونەی کە گەردونناسەکان پێمان دەڵێن هەزار ملیۆن کاکێشان (مجرة)ی تێدایە.

هەموو ئەو شتانەی هەیە هەر لە بچوکترین ئەلیکترۆنەوە تا گەورەترین ئەستێرە، وەکو ئاوازی گۆرانییەك دەمبینی، کە بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە دەهاتە گوێم، یان وەك یەك لاشە دەهاتە پێش چاوم کە گیانی لەبەردا بێت.

زانست بە ڕێگەیەکی مادییەوە، بە هۆی هۆکارێکەوە یارمەتی دەدام کە خودام بە بیردا بێت.

ئا لەم قۆناغەدا وام دەزانی خوا ئەو هێزە نادیارەیە، کە لە بونەوەردا هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی ئەم شێوە جوانانە لە زیندەوەران و دار و بەرد و زەوی و ئاسمان، خوا ئەو جوڵانەوەیە، کە زانستی لە گەردیلەو پرۆتۆپلازم و فەلەکدا دۆزیوەتەوە، خوا ئەو وزە دروستکەرەیە کە لە هەموو شتێکدا هەیە.

وەکو ( قەدیس تۆماس)[١٦] دەڵێ: خوا ئەو کردەوە خالیصەیە، کە لە میکرۆبدا دەجوڵایەوە تاکو بوو بە مرۆڤ، ئێستاش دەگۆڕێ و دەگۆڕێ، بێ دوایی هاتن هەر دەگۆڕێ.

بونەوەر لە بەرچاوم وای لێهات کە بێسنوورەو بێدواییە، وامدەزانی ژیان و جیهان هەروا دەمێنێ، و ئەو ڕۆژە نییە کە ئەم بونەوەرەی تیانەمێنێ.

کەوابوو ڕاست نییە پرسیار بکەین کێ ئەو بونەوەرەی دروستکرد، چونکە پرسیار کردن ئەوەی بەدوادا دێ کە دەبێ ڕۆژێ بووبێ بونەوەر دروست نەکرابێ، پاشان هێنراوەتە بوون، چۆنیش شتێك نەبووبێ کیانی هەیە، نەبون بۆ جیهان نییەو هیچ کاتێك نییەو نەبووە کە جیهان نەبووبێت، هەر بووەو هەر دەبێت.

---

[١٦] تۆماس یەکێکە لە دوانزە نێردراوەکەی پێغەمبەر (عیسا).

بەم جۆرە وامدەزانی کە سەرەتاو دوایی بۆ جیهان نییە، وامدەزانی هەموو شتێك کە هەبوو ئەوە خوایە، نەبون نییە، خوا بونێکی ماددییە، هەر بووەو هەر دەبێ.

ئەمەم بۆ خۆم دروستکرد بۆ بونی خوا، بە بێ ئەوەی پێویستم بەوە هەبێت کە بڕوا بە نەبینراو (غیب) بکەم.

بەڵێ بەم جۆرە کەوتمە دیلی بیرۆچکەی (وحدة الوجود)ی بیروباوەڕی هیندییەکان و فەلسەفەی (سپینۆزا[17])و بیرۆچکەی (برجسۆن) کە باسی وزەی ناوەکی دەکات، گشتیشی فەلسەفە گەلێکە کە لە زەوییەوە دەست پێدەکات، لە پێنج هەستەکان، دانیش بە نادیارەکاندا نانێت، بە قوڵتر چوومە ناو فەلسەفەی هیندییەکانەوە، وامدەزانی هەموو دراوستکراوێك دروستکەرە.

لە سیفری (یۆبانیشاد) – نوێژێکی کۆنی هیندی هەیە – ئەم مانایە لە هەندێك هەڵبەستی ناسك بە ناوی (براهی)[18] ڕاڤە دەکات.

ئەگەر بکوژ وای زانی کە بکوژەو
کوژراو خۆی بە کوژراو دانا

---

[17] سپۆنزا فەیلەسوفێکی هۆڵەندییە، لە پێشا جولەکە بوو وای دەزانی ژیان نابڕێتەوە

[18] براهما ئایینی زۆر کۆنی هیندییەکان بوو، بوزییەکان هەڵسان بە تازەکردنەوەی ئەم ئایینە.

ئەوان نازانن شێوەی کردار چۆنە!

دەبم بە سنگ بۆ ئەو کەسەی دەمرێ

دەبم بە چەکیش بۆ ئەو کەسەی دەمرێ

دەبم بە باڵ بۆ ئەوەی دەفڕێ

دەبم بە دوو دڵی بۆ ئەوانەی بڕوایان بە بونم نییە

دەبم بە هەموو شتێك، تەنانەت خودی گومانیش

بەڵام من خۆم تەنیاو بێ وێنەم

من شتەکانم

ئەو خوایە، کە لە ڕوناکییەکی سپی دەچێ، یەکە، ساکارە، بەڵام لە ناوەوەیدا حەوت ڕەنگە شەبەنگەکەی لە خۆگرتووە.

بەڵێ، چەند ساڵێك لەم تەمومژەی باوەڕی هیندیەدا ژیام و لای زۆر لە مامۆستاکانی هیندی لە بناغەو پەلەکانی ئەم باوەڕەم خوێند، بیروڕای (گیان گواستنەوە - التناسخ) بە ماوەیەکی زۆر بە سەرمدا زاڵ بوو، لە چیرۆکەکانمدا ڕەنگی دایەوە، وەك (العنکبوت)و (الخروج من التابوت).

لە پاشاندا لە حاڵەتێکی ڕازی نەبون و بڕوا پێ نەکردن بە ئاگاهاتم.

لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت ئەمیش زۆر شتی درۆی بەرامبەر بە خوا تیایە.

جارێکی تر هەر زانست بوو، کە ڕێی نیشان دامو ڕزگاریکردمو یارمەتیدام.

مانەوەم لەسەر زانستو لەسەر ئەوەی زیندەوەر بخەمە ژێر میکرۆسکۆب، شتێکی تری پێ وتم.

یەکێتی بونەوەر (وحدة الوجود)ی هیندییەکان بریتی بوو لە هەڵبەستی سۆفیانە، بەڵام ناڕاست.

ئەو حەقیقەتەی، کە زانست دوپاتی لەسەر کردەوە ئەوەیە، کە دەڵێ: کەرەستەی خاوو هەمووی یەکن لە چنینو یاساو دەستپێکردنی سەرەتاییدا یەکن لە ژیاندا، چونکە هەموو ژیانی ئادەمیزاد و ڕووەك و گیانلەبەرەکانی تر بریتییە لە گۆڕینەوەی گازی کاربۆن لەگەڵ هایدرۆجین و ئۆکسجین و کردنیان بە خەڵوز، هەموو ژیانیش بریتییە لە یەك خانەو ماکەکانی.

بۆ جارێکی تر لە زانستی گەردونناسیو زانستی ئەتۆمەوە فێر دەبین، کە هەموو ڕەگەزە جیاجیاکان (العناصر المختلفة) لە کوڵاندنی یەك ڕەگەز لە ژێر تەنوری ئەستێرەکاندا پەیدا بون، کە ئەویش هایدرۆجینە.

هایدرۆجین دیسان هەر لە تەنوردا دەبێت بە هیلیۆم و کاربۆن و سلیکۆن و کۆبالت و نیکل و ئاسن و... هتد، ئەمەش بە چەند

شـیتەڵو بەسـتنێك بـە هـۆی پلـەی گـەرماو پاڵەپەسـتۆیەكی زۆرەوەیە.

كەوابوو هـەموو بونـەوەرەكان (الموجـودات) دەگەڕێنـەوە سـەر یەك كەرەستەی خاوو گوریسی ئاوریشمی كە ئەم بونەوەرەی بەم شێوە جوانە پێی ڕێسراوە بەم هەموو گوڵو دارشتنە جوانەوە بە چەند شێوەیەكی جیاجیا.

جیـایی لـە نێـوان بابـەتو بابـەتێكی تـر بەشـێكی دروسـتكراو لەگەڵ ئەوەی تردا، جیایی لە پەیوەندی چۆنێتیو چـەندێتی، لـە هاوكێشـەو نهێنـی پێكهاتەیـدا، بـەڵام كەرەسـتەكەیان یەكێكـە، لەبەر ئەمەیە هەست دەكرێ بە نزیكی و خزمایەتیو دڵسوتان لە نێـوان ئـادەمیزادو گیانلەبـەرەكانی تـردا، لـە نێـوان لـوتو بـۆنی خۆشی گوڵو چاوو دیمەنێكی جواندا.

ئـا ئەمـە نهێنـی هـارمۆنی و گونجاندنـە، هـەموو بونـەوەرێك ئەندامی یەك خێزانی دایكو باوكێكە.

كەوابوو ئەمە درۆیە پارچەكانی بونەوەر خۆیـان دروسـتكەری یەكتر بن، یان خوا بونەوەرە، یـان دروسـتكراو دروسـتكەرە، ئەمـە شتێكی تێكەڵ و پێكەڵی سۆفیانەی ناڕاستە.

ئەمـە وەكـو ئـەوە وایـە كـە ڕەخنـەگرێك بڕواتـە پێشـانگایەكی وێنە، كە ژمارەیەكی زۆر تـابلۆو وێنـەی تێدا هـەبێ، لـەو هـەموو

وێنانە وێنەیەکی جوانی بەدی کردو بۆی دەرکەوت ئەم هەموو وێنانە لەسەر شێوازی ئەم تاکە وێنەیە دروستکراوە.

یەکسەر دەڵێ ئەم وێنانە هەموویان یەك هونەرمەند دروستیکردون، ئەم وێنانە (پیکاسۆ)، (شاکاڵ) یان (مۆدیلیانی) بە پەڕی ڕەنگین کێشاویانە.

کەواتە یەکێتی لە نێوان دروستکراوەکان مانای بونی یەك بەدیهێنەری دەگەیەنێ.

بەڵام مانای ئەوە نییە خودی دروستکراوەکان دروستکەرن.

ڕەخنەگرەکەش هەرگیز ناڵێت ئەم وێنانە خودی وێنەکێشەکەیە.

یەکێتی بونەوەری هیندییەکان تەڵەکەو دەستبڕینە، ئەمە ساویلکەیی ویژدانە، نە زانست و نە عەقڵ دان بەمەدا نانێت.

بەڵکو هەموو بیردۆزە زانستییەکان بۆیان دەرکەوتووە، کە یەکێتییەکی تەواو هەیە لە نێوان هەموو دروستکراوەکانی جیهاندا، یەکێتی شێواز، یەکێتی یاسا، یەکێتی کەرەستە، ئەمانە هەموو ئەوە دەگەیەنێ کە دروستکەرەکەیان یەکەو یەك کەس هەموویانی دروستکردوەو هەر تەنیا بە شێوازە نازدارەکەی خۆی و بەبێ ڕازیبون بەشێوازی یەکێکی تر.

دیسان زانست پێمان دەڵێ، ئەم دروستکەرە خاوەنی ژیرییەکی گشتی و دەسەڵاتێکی وەهایە رێگەی چۆنیەتی گەورەبون و چۆنیەتی ژیانی بۆ هەموو دروستکراوەکانی داناوەو چەکداری کردون بەرامبەر دوژمنەکانیان بۆ مانەوەیان.

ئەو دروستکەرە ئەوەیە کە بال دەدا بە تۆوی داری بیابانییەکان تاکو بفرێت و بگات بە شوێنی ئاودار بۆ رواندنی.

ئەو دروستکەرە ئەوەیە کە بەبێ پێوتنی مامۆستا (ئەرخەمیدس)[19] تورەکەی هەوایی بۆ گەرای مێشوولە دەکات، تاکو لە ئاودا نوقم نەبێت و نەخنکێت.

بەڵێ بۆم دەرکەوت کە ئەوە دروستکەری ئەم هەموو دروستکراوانەیە، بالادەستە، ئەوەی ئەو دەیزانێ ئێمە نایزانین.

بە توانایەو شتی وا دەبینی کە کەسی تر ناتوانێ بیبینێ.

خودا تاکە، بە توانایە، زانایە، لێزانە، بیسەرە، بینایە، ئاگادارە، هەموو سیفەتێك دەدات، بە دەسەلاتە، دەبیستێ.

پەیوەندی ئەم دروستکەرە لەگەڵ دروستکراوەکانی نزیك ترە لە هاتوچۆی خوێن بەناو لەشدا[20].

---

[19] ئەرخەمیدیس زانایەکی یۆنانییە و خاوەنی چەند بیردۆزەیەکی زانستییە، بەتایبەتی (نظرية الطفو).

[20] (وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ) (ق: ١٦).

هەر ئەو دەتوانێ كە ئەم جیهانە بەم وردییەو دوور لە هەموو هەڵەیەك برازێنێتەوە.

هەر ئەو خودا دادگەرەیە كە یاساكانی خۆی پتەوكردوەو لەسەر چەند ڕێسایەكی ورد دایمەزراندووە كە هەڵە ناكات، ئا بەم شێوەیە زانست فیكرەی تەواوی ئیسلامی دەربارەی خودای پێشكەش كردم.

ئەوەی كە دەڵێ ئەم جیهانە هەر بووەو هەر دەبێ نەبووە، بێجگە لە یاریكردن بە وتە هیچی تری تێدا نییە.

لە واقیعیشدا نەبوو، نەبوو نییە.

نەبووش لە تێڕوانین و فیكردا نەرێی ئەوە دەكات كە نەبێ.

بە زۆریش نەرێی ئەو شتەیە دەیزانین، بەڵام نەرێییەكی ڕەها نا، كە بە تەواوی بسڕێتەوە، بیرۆچكەی نەبونی ڕەها (العدم المطلق) گریمانەیەكی وەك گریمانەی سفری بیركاریی، ناشكرێ و دروست نییە گریمانەو واقیع تێكەڵ بكەین، دروستیش نییە واقیع بكەینە گریمانەیەكی تیۆری و بە كوێرانە بڵێین نەبون نەبووەو وا دابنێین ئەم قسەیە مەسەلەیەكی وجودیە، كە لە واقیعدا چەند یاسایەكی لەسەر بنیات بنێین، ئەمەش هاودژییەكی ڕاشكاوانەو قسەیەكی بێ هودەو بێ خێرە.

بە هەمان نموونەش بڵێین بونەوەر بووە، ئا لێرە هەمان تێکەڵی دەبینین، چونکە بونەوەر شتێکی ڕوتی زیهنییە، مەوجودیش واقیعێکی هەستیارییە، جا وشەی نەبونو وشەی هەبون دوو شتی ڕوتی زیهنین وەك سفر، دروستیش نییە تێکەڵی بخەینە کۆتایی (اللانهایة) و واقیعی بەرهەست، هەروا بونەوەر کە هەیەو دیاریکراوە ناکرێ لەبەردەم دەستەکاندا بنرێ.

کەواتە بونەوەر تا سەر نامێنێ و نەبونی دەبێت وەکو نەبونی بووە بە پێی دوا فەرهەنگی زانست – یاسا دوەمی – دینامیکای گەرمی، ئەم یاسایە دەڵێ:

( گەرما لە تەنێکی گەرمەوە دەڕوات بۆ تەنێکی سارد، تاکو لە گەرمیدا وەکو یەکیان لێ دێت، ئیتر لە پلەیەکی گەرمایی یەکساندا ڕادەوەستن تاکو دەست دەکەن بە ساردبونەوە ).

ئەگەر ئەم بونەوەرە هەر ببوایە بەبێ سەرەتا ئێستا هەموو هێزێکی گەرما بەکاردەهێنراو ژیان نەدەما تاکو ئەمڕۆ، دیسان مردنی ئادەمیزادو مردنی شارستانیەتیو مردنی ئەستێرەکانو هەموو گیانلەبەرانی تر.

خودی ئەم یاسایەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم بونەوەرە سەرەتای هەبووە.

ئەو قیامەتە گچكەی كە لە دەوروبەرماندا دەیبینین، هەر لە مردنی ژیارەكان و مردنی خەڵك و مردنی ئەستێرەكان و مردنی گیانلەبەرو ڕوەكەكان و كۆتایی هاتنی ساتە وەختەكان و ساڵەكان دیمەنێكی تری قیامەتی گەورەیە كە پێمان دەڵێ هەر دەبێ ئەم بونەوەرە كۆتایی پێ بێت.

بەڕاستی زانست هەرگیز دژی ئایین نییەو بەربەرەكانێ ناكات لەگەڵ ئاییندا، بەڵكو ئادەمیزاد هەر بە زانست دەتوانێ مانای ئایین بزانێ.

بەراستی هەر نیوەی زانستە گومان و دوودڵی دەخاتە ناو عەقڵەوە، بەتایبەتی گەر ئەم عەقڵە بەخۆی بنازێ و لوت بەرزبێ و پشت بە عەقلانیەتی خۆی ببەستێ، بەتایبەتیش گەر لە سەردەمێكدا جەنگێك لە ئارادابێ، كە وا بزانرێ عەقڵ تێیدا هەموو شتێكە، هەروا گەر مرۆڤ تەنها ژیاری ماددیی ببینێت، كە فڕۆكەو كەشتی ئاسمانی و مانگە دەستكردەكانی تێدا بنەڕێنێت و هەر ساتێك هاوار بكات:

من ماددەم... من هەموو شتێكم.

- لەش :

هەموومان یەك ڕەگەزین
لەیەك كەرەسەی خاودا.
هەر یەكەمان خاوەنی تاكێكی سەربەخۆین.

جیاوازی لە نێوان دروستكراوەكاندا تەنیا جیاوازی كەم و زۆری گەردیلە (ذرة)كانی نییەو بەس، بەڵكو جیاوازییەكی گەورەتر هەیە كە ئەویش چۆنیەتی لكاندنی ئەو گەردیلانەن پێكەوەو جۆری پەیوەندییان.

ئێستا لە هەڵپێچانی تۆوەكانی بۆماوەیی (الجینات الوراثیة) لە یەكەم خانەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە هەموو كۆڕپەی مرۆڤ زیاتر لە (٢٠) پیتی كیمیاوی لە پرۆتین (DNA) و (RNA) تێكەڵی دەبێ وەكو چۆن هەموو پەڕاوو پەرتووكەكان لە پیتەكانی ئەلف و بێ پێك دێت، كەچی هەر پەرتووكێك جۆرە شێوازو مەبەستێكی تایبەتی هەیەو دەڵێی دروستكراوێكی جیاوازە لە پەرتووكەكانی تر، لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان یەك جۆرە پیتن.

لەمەش ڕوونتر، دەبینی كە هێڵی پەنجەكانی دوو كەس لە یەك ناچن با برا بن، یان بە جووتەش لە دایك بووبن، سەرەڕای

ئەم هەموو هەزاران ملیۆن خەڵكەش هەر لە ڕۆژی دروستبونی ئادەمیزادەوە تاكو ئێستا.

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ كە هەر لەشێك جۆرە داڕشتنێكی كیمیایی تایبەتی خۆی هەیەو نابێت كە پارچەی لەشێك بۆ پینە بەكاربهێنرێ بۆ لەشێكی تر، هەروا جەستەش ئەو پارچە نامۆیەی قبوڵ نییە، جا ئەو شتە میكرۆب بێ یان تەنێكی بێگانە بێ.

ئەمەش گەورەترین كۆسپە لە ڕێی پزیشكە نوژدار (جراح)ەكانداو ناتوانن بە ئاسانی پارچەی لەشێك بنێن بە لەشێكی ترەوە.

درێژترین ماوەی ژیانی دڵێك كە لە جێی دڵێكی تر دانرابوو (٢٠) مانگ بوو، ئەویش بە ڕەهێڵە دەرزیو بەنجو حەبی دژی (حساسیە) یان بەسەریا دەباران، بۆ مانەوەی ئەم دڵە تازە لەو لاشەدا.

مانای ئەوەش ئەوەیە كە تاكیەتیو بەتاك كردنی ڕاستیەكی كرۆك (جوهر)یە، كە زانست گەواهی بۆ دەدات.

ئەمەش ڕاستییەكە كە لە سەرەتای پێشكەوتنی فیكرم ئاوڕم لێ نەدابوەوە، وامدەزانی ئەوەی كاكڵەیە و دەمێنێ، كۆمەڵە نەك تاك، مرۆڤە نەك فلان، ژیانە نەك ژیاو، هەمووە نەك یەك.

ئەمەش شوێنەوارێكی فەلسەفەی هیندییەكانە، كە دەڵێ:
بون خوایەو دەمێنی هەتا سەر، بەڵام هەموو ئەو شتانەی هەن بریتییە لە (المایا) (MAYA) كە ئەویش خەیاڵێكە نامێنێ، هەر كە مرد دەڕزێ و ئیتر زیندوو نابێتەوە، پاش مردن پاشەكەوتی هەر ئەوەیە پەروەردە و زانست و سامانی بۆ منداڵەكانی بەجێ دێڵێ.

بەڵام خۆی هەر ئەوەیە دەدرێت بە دەم هەواوە باڵ دەگرێتەوەو بەشی هەتا هەتاییمان ئەوەیە، كە دەچینە ناو دەفری هەموانەوە، ئیتر نرخ و كەسایەتی ئەم ئادەمیزادە كامەیە؟

من هیچ لە كەسایەتییە نەگەیشتبووم، جگە لەوەی كە بریتی بێت لە چەند كاردانەوەیەكی بارودۆخی بەسەر چەند هەڵوێستێكی كاتییدا، جا هەركە ڕەوشەكە كۆتایی پێهات و كاتەكە گۆڕانی بەسەردا هات، هیچ لەو كەسایەتییە نامێنێت، لە ئەنجامدا بە پیربون و هەڵوەشاندنەوەی ڕیشاڵەكانی مۆخ ئەمیش نامێنێت.

كاتێكیش دەمارەكان تێك دەچن و بە مردن لەناودەچێ هەمان خودی تایبەتی لەناودەچێ.

وامەزانی كەسایەتی تەنها دابڕانێكی دیاریكراوی چەند سیفەتێكی دیاریكراوە، بە كاریگەری چەند ئەزموونێكی زیندوو و چەند كردەوەیەكی پێچەوانەی دەمارگیرییە.

كە هەندێكی لە شێوەی غەریزەدا بۆمان ماوەتەوە، هەندێكی تریش لە ڕێگەی مومارەسەی هەستی وەرگیراوە، ئەم مومارەسەیەش لە مێشك تۆمار دەكرێ‌و لە بیرەوەریدا چاپ دەبێ، جا ئەگەر مێشكەكە كۆتایی هات‌و خانەكانی بیرەوەریی گەندەڵ بوو ئەو كاتە پێویست بە مانەوە ڕۆحانیەكەی تری ئەم پەیوەستە ماددییە پوختە ناكات.

لە سەرەتادا بەم چەمكە ماددییە ڕووكەشەوە دەمڕوانییە ئادەمیزاد، بە خۆشم دەگوت كەسایەتی یەك شت نییە لە هیچ كەسدا! هەر كەسە چەند كەسایەتییەكی هەیە، كەسایەتی تەمەنی (١٥) ساڵی جیایە لەگەڵ كەسایەتی تەمەنی (٢٠) ساڵی، (٢٠) ساڵی لەگەڵ (٣٠) ساڵی.... هتد.

هەموو تاوێك لەو كەسە شتێك كەم‌و شتێك زیاد دەكات.

ئیتر كام كەسایەتی لەمانە زیندوو دەكەنەوە بۆ لێپرسینەوەو سزادانی، یان پاداشتدانەوەی؟ ئەوانەی كە تووشی دابەشبونی كەسایەتی بون كامەیان دەچێتە جیهانەكەی تر دكتۆر (جیكل) یان مستەر (هاید)؟

بەڵێ بەم جۆرە شەرە وتەی پووچ دەكەن، نازانن ئەگەر ئێمە بمانەوێت پەرتوكێك بۆ جاری دووەم لە چاپ بدەینەوە، یەك پەرە یان یەك باس لەو پەرتوكە چاپ ناكەین، بەڵكو هەموو پەرتوكەكە بە هەموو لاپەرەو باسەكانییەوە لە چاپ دەدەینەوە.

هەر بەم جۆرە مرۆڤ بە هەموو بەشەكانییەوە زیندوو دەبێتەوە وەكو دەنكێك گەنم كە فرێ دەدرێتە ژێر تاریكی زەوییەوە، كاتێ سەوز دەبێت و دەروێت، هیچ شتێك لە شێوەی گەنمەكەی لەبیر ناچێتەوە. چۆن بووە هەر بەو جۆرە دەروێتەوە.

بەڵام دیدگای ماددی كە بە سروشتی خۆی بە لای شیكردنەوەو توێكاری و لەت لەت كردنە، بە درێژایی كاتیش هەر ئەمە زاڵ بووە، جا لەبەر ئەمە هەردەم وێنەی تەواوی شتەكانم لەبەرچاو نادیار بووە.

وامدەزانی كە ئەگەر لاشە یەكالا (تشریح) بكەم گیانم دەست دەكەوێت، چونكە لام وابوو گیان (روح) هەر لاشەیەو هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان گیان و لاشەدا.

گیان لاشەیە.

عەقڵ مێشكە.

كەسایەتی چەند كاردانەوەو چەند كردەوەیەكی پێچەوانەی ئارەزووە.

سۆزیش لە کۆتاییدا برسێتی لاشەیە بۆ ئەو شتە.

بەڵام لێرەدا ئێمە هەڵوەستەیەکی درێژ دەکەین و پرسیار دەکەین:

ئایا ڕاستە نەفس پاڵنەری برسێتی و جنس و کۆمەڵە هەستپێکردنێکە کە جەستە پەی بە پێویستیەتی دەبات ؟

گەر ئاوامان گوت، ئەوا ئێمە لەبەردەم تەفسیرێکی ماددیی کوێرانەداین، ئەمەش نەحەقیقەتی نەفسەو نە حەقیقەتی مرۆڤە، دەشگەڕێمەوە لاپەڕەکانی کتێبی (لغز الموت) و (لغز الحیاة)، کە بە درێژی تاوتوێی بابەتەکەم کردووە.

مرۆڤ قوربانی بە پاروە نانەکەی و جێگە گەرمەکەی دەدات لە پێناو چەند ئامانج و نموونەی بەرزو ڕوتی وەك دادگەریی و حەقخوازی و خێرخوازی و سەربەستی، کەواتە کوا پاڵنەری برسێتی و ئارەزووی جنسیی؟ ئەوەی خۆی دەدا بە کوشت بۆ هاتنی ڕۆژێك کە هێشتا نەهاتووە، ئیتر ئەو لە تەفسیری ماددیی لە کوێیە ؟

ئێمە لەبەردەم سەلماندنێکی بڕەرداین، کەوا نەفس و خود (ذات) حەقیقەتێکی لە سنوربەدەرو بەرزە بەسەر لاشەدا، تەنیا پێداویستی هەستی جەستە نییە کە لە ئاوێنەی ئاوەوە ڕەنگی دابێتەوە.

ئەو هێزەی کە لاشەکەی خۆی پێشێل دەکات و دەیدات بە قوربانی ئەوە سەرۆك‌و فەرماندەیە بەسەر لاشەداو کلکی نییە، چونکە ئەگەر من بەس لاشە بم چۆن دەتوانم زۆر لە لاشەم بکەم‌و بیدەم بەسەر هەزاران بەردی ساردو گەرمدا.

یا من گەر برسیی بم چۆن دەتوانم کە برسیم بوو خۆم بگرم.

جا بە تەنها دەسەڵاتی ناوەکی بەسەر گشت توخمەکانی جەستەو موفرەداتی غەریزەکان، شایەتی ئاشکراکەری ئەم توخمە بەرزەو ئەو جیاوازییانەیە کە خودی مرۆڤایەتی لێ پێکدێ.

لە ڕێگای نەفسەوە لاشەم هەڵدەسوڕێنم.

لە ڕێگای عەقڵەوە نەفس هەڵدەسوڕێنم

لەڕێگای بەرچاوڕوونییەوە سنوورێك بۆ هۆش دادەنێم.

ئەو بەشانەی لە لاشەماندا هەن هەریەکەیان فرمان دەدات بەسەر ئەوەی لە خۆی خوارتردا، لێرەدا فەرماندەیەك لە هەموویان بە دەسەڵات ترە، فەرماندەی هەموو تێشووەکانی لەشە، کە ئەویش گیانە، گیانیش کلك‌و پاشکۆی نییە، کە بە مردنی بمرێ.

ئەو مادییانەی دەڵێن ئادەمیزاد بریتییە لە کۆمەڵە پێویستییەکی فسیۆلۆجی ماددیو بەس، ئەوەمان بۆ ڕاڤە بکەن، لە کاتی نوستندا ئەم مرۆڤە دەچێتە کوێ ؟

سەیر دەکەیت هەموو کردەوە فسیۆلۆجییەکانی لەش بەردەوامن لە ئیشکردن لە کاتی نوستندا گشت کردەوەکانی خۆنەویستی (لا إرادی) بە ڕێکوپێکی کار دەکەن، دڵی لێ دەدات، سییەکان هەوا ئاڵو گۆڕ دەکەن، ئارەزوی پیاوەتی (الجنس) هێرش دەهێنێ، ئەگەر دڕکێك بچێت بە دەستدا دەستی هەڵدەکێشێت، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم نوستووە لەبەر دەستماندا کەوتوە، دەڵێی دارێکی ڕەقە، یان ژیانێکی سەرەتاییە، کە لە ژیانی زیندەوەر جیاوازی نییە، ئیتر کوا ئادەمیزاد ؟

خەوتن و لە خەو هەڵسان نموونەیەکی بچووك کراوەیە بۆ زیندوبونەوەی پاش مردن، ئەو نوستوە بێدەسەڵاتە سەیر دەکەیت یەکسەر هەڵدەسێ و بەبێ خۆئامادەکردنەکەی (هیتلەر)و (نیرون) ئەو کردەوانەی لە پێش نوستندا دەیکردن ئێستاش دەیانکات و هەرچی پێش نوستن کردویەتی دێتەوە یادی.

لێرەدا مادییەکان لەبەردەم ڕاستییدا سەرشۆڕ دەکەن و ناتوانن بڵێن (نفس) نییە، دەڵێن (نفس) هەیەو ڕاستە، چونکە لە ئەنجامدا بە ماددە دادەنرێت.

ئێمەش دەڵێین (نفس) چۆن دەبێتە بابەت؟ دەبێتە بابەتی کێش؟ هەتا ئەگەر ئەو کەسەیش پارچە پارچە بکرێت و بخرێتە ژێر میکرۆسکۆبەوە نابینرێت، ئیتر ماددە چییە؟

سەبارەت بە کەسانی تر بابەتە؟ چۆن وایە؟ ئەوانی دیش هەست بە بونی ناکەن مەگەر لە ڕوکەشی ڕەفتارەوە هەڵیهێنجن.

ئەو ڕوکەشانەش زۆر نییە، یان درۆ نییە، هەر یەکێك لە ئێمەش نمایندەی خەڵکە، بەڵکو نمایندەی خودی خۆی و ڕەفتاری ڕوکەشیەتی، کەم جار هەیە ببێتە بەڵگە لەسەری.

یان بابەتە سەبارەت بە خاوەنەکەی؟

کەوابوو دەبێ ئێمە بڕوامان بە شتێك هەبێت، کە نابینرێت، ئێمە هەستکەرو هەست پێکراومان هەیە.

مەرجی هەستکەر ئەوەیە لە دەرەوەی هەست پێکراوەوە بێت، کەوابوو ئەو هەستکەرەی ئێمە هەمانە لە دەرەوەی لەشمانە، چونکە ئەگەر لەناو لەشدا بوایە هەستمان بەس بە شتەکانی ناو لەشمان دەکردو ئاگاداری دەرەوەی نەدەبوین و بیرەوەریمان

لەگەڵ چرکەژمێردا دەڕۆیشت و بێ ئاگا دەبووین لە پێش ئەو کاتە.

ئەمەش یاسایە دەڵێ: هەست بە هیچ شتێك ناکەیت، ئەگەر لە دەرەوەی ئەو شتەوە نەبێت.

تۆ هەست ناکەیت بە سوڕانی زەوی، چونکە خۆتی لەسەری، بۆ زانینی چۆنێتی سوڕانی گۆی زەوی دەبێ لە دەرەوەی سنووری زەوییەوە بوەستیت، خۆ ئەگەر لەسەر زەوی بیت تۆش پارچەیەکی زۆر بچوكو نادیاری زەویت.

هەروەها بۆ زانینی جوڵان یان زانینی چۆنیەتی هەموو شتێك دەبێ لە دەرەوەی ئەو شتەوە بیت، کەوابوو چونکە هەست بە ڕۆیشتنی ڕۆژگار دەکەیت تۆ لە دەرەوەی ئەو ڕۆژگارەیت.

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت بونی گیان (روح) جیاوازە لە بونی ئێمەو پلەی بەرزترە لە بونو لاشەو ڕۆژگاری ئێمە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە ئێمە دەبین بە دوو بەشی سەرەکییەوە، بەشێکمان چەقیوەتە ناو ڕۆژگارو دەڕوات لەگەڵیا، گەورە دەبێت، پیر دەبێت، لە هێز دەکەوێت، هەتا دەمرێت، ئەمە لاشەیە.

بەشەکەی ترمان لە دەرەوەی ڕۆژگارە، کە گەورە نابێت، پیر نابێت، ناسوێت، کاتێ لەش دەبێت بە گڵو مێروو دەیخوات ئەو

هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە، ئەم بەشە ئەوەیە کە ئاینەکان پێی دەڵێن گیان (روح).

هەرکام لە ئێمە دەتوانێ لە ناخی خۆیدا هەست بە بونی ئەم گیانە بکات، هەروا بۆی دەردەکەوێت کە چۆنیەتی ژیانی گیان جیاوازە لەگەڵ جۆری ژیانی لاشە.

هەر یەکێك لە ئێمە هەردەم دەتوانێ لە ناخیدا هەست بە حاڵەتێکی ئامادەیی و گوێڕایەڵی و کەسایەتی و هەست بە بونێکی حازرو تەواو و جیا لەو وجودە ماددیە گۆڕاوەی، کە لە دەرەوەی زەمەن لێدەدات و دەلەرێتەوە بکات.

ئەم حاڵەتە ناوەکییەی کە لە ساتەکانی بە ئاگابونی ناوەکییەوە هەستی پێ دەکەین، کە ناوم لێناوە حاڵەتی (ئامادەبون)، ئەوە ئەو کلیلەیە کە لە ناخمدا بەرەو بونی گیانمان دەبات، دەستیشمان دەخاتە سەر ئەو شتە نادیارەی، کە ناوی گیانە، یان ڕەهایە، یان (مجرد)ە.

ئێمە هەر کاتێك شتێکی جوان دەبینین جیای دەکەینەوە لە شتی ناشیرین، یان ڕاستی دەبینین جیای دەکەینەوە لە درۆ، یان دادپەروەری دەبینین جیای دەکەینەوە لە ستەم.

بۆ زانینی ئەمانە گەزو ترازوومان هەیە، کە جوان لە ناشیرین و ڕاستی لە درۆو.... هتد پێ جیا بکەینەوە، ئەم ترازووەش گیانە.

بۆ نموونە: ئێمە دەزانین دەبێ هەموومان بمرین و کەسمان تا سەر نازین، کەچی هیچ کاتێك خۆمان بۆ مردن دانانێین وەکو هەر نەمرین، یان مردن ناوی هەیەو ناوەرۆکی نییە، بەس بایەو بە لای گوێماندا دەڕوات، بەلام ئەوەی کە ئەم نوزەمان دەدات بە گوێدا گیانە، ئەو گیانەی کە خۆی نازانێ مردن چییە.

من بۆ گیانی ئەو بریتییە لە داڕنینی کراسێك لەبەریا – بێ زیادو کەم – ئەو مردنەی کە بریتی بێت لە نەمان و ڕزین بۆ گیان نییە هەردەم هەیە.

وەکو زانایانی تەسەوف دەڵێن: گیان بەرگی لە خۆڵ دادەڕنێ و بەرگی بەرزەخی لەبەر دەکات، پاشان بەرگی بەرزەخی دادەڕنێ و بەرگی مەلەکوتی لەبەر دەکات، دیسان ئەویش دادەڕنێ و بەرگی جەبەڕوتی لەبەر دەکات، بە خۆکوشتن و هەوڵدان پلە بە پلە سەردەکەوێ بۆ لای خۆشەویستەکەی کە بەدیهێنەرەکەیەتی هەموو گیانێك بە ئەندازەی پاکی و ڕۆشنی و توانستی خۆی بەرز دەفڕێ.

سۆفیگەرییەكان بۆ دیدی خۆیان بەجێ دێڵم تا لەگەڵ ئەواندا ون نەبین و چەواشە نەبین، ئامانجیشم لەم توێژینەوەیەدا بڕینی بەربەستی مردن نییە تا بزانین دوای مردن چییە، چونكە زانینی ئەمە ئارەزوویەكی مەحاڵە.

ئەوەنـدەم بەسە هەڵوەستە بە خوێنەر بكەم تا لە خۆی ڕابمێنێ و خودی قوڵ و بە دەسەڵات و فەرماندەی بەرزی جەستە خۆڵییەكەی ئاشكرا بكات، كە ناوم لێناوە گیان (روح) كە ئەوپەڕی بەڵگەم لەسەری هێناوەتەوە، بە هەستی بون و ئامادەییەوە كە هەریەكێك لە ئێمە لە ناخییەوە هەستی پێدەكات.

ئەو بون و ئامادەییە بەردەوامەی كە نەمانی بەسەردا نایەنێ و گۆڕانكاری بەسەردا نایەت، وەك بڵێی هەردەم لە ناخمدا چاوی كراوەیە، ئەوەش ڕابون و بە ئاگایی ناوخۆیە.

گیان ئەو ڕوناكییە نەبینراوەیە لە ناخماندا كە بە هۆیەوە ڕێگای حەقی پێ دەبینین و ئاشنای جوان و ناشیرین و چاكەو خراپە دەبین.

گیان ئەو ڕوانگەیەیە كە لەسەریەوە چاودێری جوڵەی كات دەكەین و بە ڕۆیشتنی دەزانین، هەروا ڕۆیشتنی شتەكان دەبینین و هەست بە جوڵەی دەكەین.

گیان ئەو خاڵەیە کە لەناو بازنەیەکدایە.

گیان ئەو چەقەیە کە ڕوداوە دنیایی و کاتییەکان بەدەوریدا دەسوڕێنەوە کە لە شوێنێکدا چەقێنراوە و نابزوێ و هەر شتێك کە هەیە بەبێ ئەو ناڕوات و کۆتایی نایەت.

گیان ئەو مەتەڵە گرانەیە کە هێشتا بە تەواوی لای ئێمەی ئادەمی هەڵنەهێنراوە.

ئایا گیان هەمیشەییەو نامرێ، یان کاتێکی تری هەیە، کە جیاوازە لەگەڵ ئەو کاتەی ئێستا، کە ڕۆژێك بە هەزار ساڵە؟

دەبا بزانین پەیوەندی گیان بە لەشەوە چییە؟

پەیوەندی هۆش بە مۆخەوە چییە؟

پەیوەندی بیرو زانین و وەرگرتنی زانست لەگەڵ گیاندا چۆنە؟

## ـ گیان :

ئێوارەیەك بە دڵمدا هات کە سەرێکی ژێرخانی بیرەوەریم بدەم، پارچە کاغەزێکم هەڵگرت و دەستم کرد بە نوسینی ئەو ژمارانەی کە لەبەرمە، سەیرم کرد ژمارەی ئۆتۆمبیلەکەم و ژمارەی خانوەکەم و ژمارەی تەلەفۆنەکەمان و ژمارەی تەلەفۆنی هاوڕێکانم و تەلەفۆنی چەند شوێنێکی پێویست و خشتەی لێکدان و کۆکردنەوە و لێدەرکردن و دابەش کردن و مێژوی لە دایکبونی خۆم و لە دایکبونی منداڵەکانم، هەروەها ژمارە نەگۆڕاوەکانی ماتماتیك و سروشتگەری وەکو: ڕێژەی نەگۆر و خێرایی تیشك و خێرایی دەنگ و پلەی کولاندنی ئاوو ئەو شتانەی کە لە زانستگای پزیشکی فێری بووم وەکو ڕێژەی شەکر لە خوێندا، ژمارەی خڕۆکەی سوور و سپی. قەوارەی خوێن، لێدانی دڵ، خێرایی هەناسە، داوو دەرمان. لەم کاتەدا هەر لەبەر پارچە کاغەزەکەم پڕ کردەوە لەو ژمارانەو لەو ڕێژانەی لەبەردەممدا دەڕۆیشتن دەتگووت من ژمێریارێکی ئەلکترۆنیم، بەڕاستی سەیر بوو.

چۆن ئەم هەموو شتانەم لەبەرکەم، ژمارەی وا هەیە شەش تا حەوت ژمارە درێژە!

ئەم ژمارانە لە پێچاوپێچی مێشکدا لە کوێ خۆیان شاردۆتەوە؟!

ئەی چۆن ئەم ژمارانە داوا دەکەیت، کە وەك بروسکە بە تیژی لە هۆشدا دەدرەوشێتەوە؟

ئەم ژمارە جیاجیایانە بە چ شێوازێك ڕیز دەکرێن؟ کە هەر ژمارەیەك یاداشتنامەیەکی لەگەڵدایە مانای خۆی ڕاڤە دەکات، ئەدی چۆن بە سەدەها ژمارە لە مێشکماندا کەڵەکە بون و تێکەڵ نابن، هیچ کامێکیش ئەویتر ناسڕێتەوە؟

جگە لە ژمارە، هەزاران ناوو هەزاران وشە، هەزاران شێوە، هەزاران ڕوو، کە لە سەرماندا پڕبووە.

جگە لە زانینی تام و ڕەنگ و بۆن، هەڵمژینی جۆرەکانی هەوای سارد و گەرم و وشك و تەڕ، گریان و پێکەنین، هاوار، پارچەیەك لە مۆسیقا، گۆرانی، کۆنە زامێکی سەر ڕوو.

کاتێ باسی ترشی شتێك دەکرێت، ئاو دەزێتە دەمی پیاو، یان باسی تاڵی دەکرێت، یادی خواردنەوەی دەرمانێکی تاڵ و نەخۆشییەکی ناخۆش دەکاتەوە.

ئەمانە هەموو هەڵگیراوو ئامادەن و تۆمارکراون زۆر بە وردی، هەر یەکێك لەمانە پسولەیەکی لەگەڵدایە بۆ زانینی شوێن و

مێــژوو نــاوی کەســەکانی و کــاتی ڕوداوەکــە، بەڕاســتی ئەمــە موعجیزەیەو ناوی بیرو هۆشە.

هەنـدێك شـت هەیـە وا دەزانـین لـەبیرمان چوەتـەوە، کەچـی بـە هـۆی شـتێکی تـرەوە بیرمـان دەکەوێتـەوە، هـیچ نییـە ئـادەمیزاد بەتەواوی لە بیری بچێت.

چاودێرێکی ڕاستەقینە لەگەڵماندایە کە هـەموو خەتـەرەیـەکی دڵمان بە قەڵەمو کاغەزەوە دەنووسێ.

هەنـدێ جـار وا بـە خەیاڵمانـدا دێ ئەمـەمان لـەبیر کـردووە، کەچی بەدەری دەخەین لە بیرمان نەکردوەو هەیە، کە لە ناکاو لە کاتی پشوو، یـان خـەون یـان دوای خواردنەوەیـەك، یـان لـە کـاتی چوونە لای پزیشکێکی دەرونی بە دەردەکەوێ. هەندێ جاریش لە کاتی خلیسکانێك، یان هەڵەیەکی ڕێنووسی بەدەردەکەوێ.

هـیچ شـتێك ون نابێـت، هـەموو ڕابردوویـەك، هـەموو لێـدانێکی دڵ، نوسراوە.

بەڵام پرسیاری گەورەو مەتەڵی سەرسوڕهێنەر ئەوەیە:

ئەم وێنانـە لـەکوێ خۆیان شاردۆتەوە؟ ئەو ئەرشیفە نهێنییە لـە کوێیـە؟ ئەمـە پرسـیارێکی زیـاتر لـە زانایـەك و زیـاتر لـە فەیلەسوفێك ویستوویانە وەڵامی بدەنەوە.

فەیلەسوفە ماددییەکان دەڵێن: بیرهێنەر (ذاکرة) لە مۆخدایە، ئەمە هیچ نییە بێجگە لە چەند گۆڕانێکی کارەبایی کیمیاوی کە لە مۆخدا ڕوو دەدات بە هۆی تۆمارکردنی ئەو کردەوانەوە، وەکو چۆن لە شریتی تۆمارکەردا (المسجلة) ڕوو دەدات، ئەو پێچراوە تۆمارکراوانە هەر لە خۆیانەوە دەسوڕێنەوە لە کاتی داواکردنی هەر شتێکدا بە وردیی سپاردەوە، لێی دەداتەوە.

بیرهێنەر (ذاکرة) بەس وێنەو نەخشەی هەڵکەنراوە لەسەر خانەکان (الخلایا).

دواڕۆژی ئەویش هەر ڕزینە وەکو هەموو خانەو پارچەکانی تری ئادەمیزاد کە بە مردن کۆتایی دێت.

بۆچوونێکی جوان و ئاسانە، بەڵام خاوەنەکانی خستۆتە ناو خولگەیەك، کە نەتوانن لێی دەرچن.

ئەگەر بیرەوەری (ذاکرة) بریتی بێت لە ماددەیەکی کتوپڕ، کە بەسەر مادەی خانەکان دابێت، پێویستە بە لەناوچونی هەر خانەیەك لایەك لە بیرەوەری نەمێنێ، یان هەر لە بیرچونەوەیەك خانەیەکی لەگەڵدا نەمێنێ.

بەڵام ئەمەیش لە نەخشی مۆخدا نابینرێت، ئەگەر چەند خانەیەکی نەمێنێ بیرەوەری هەر دەمێنێ، چونکە سەرچاوەی

وشە لەناو دەچێت، نەك بیرەوەری وشە، ماسولکەی دەنگ نەك ئەرشیف.

بیرەوەریی هێزێکە لەگەڵ هۆشدا بە هێزی زیهن دەمێنێ و هیچ پەیوەندییەکی بە مێشکەوە نییەو ئەرکی مێشك بیرهێنانەوە نییە.

مێشك بەس شێوەی وشە دەگۆڕنەوە لە وێنەوە بۆ وتە، تاکو ئەو خەیاڵەی لە دڵدایە بیکات بە دەنگ و بیدات بە داوەکانی دەنگ، لەوێوە بۆ دەم، وەك ڕادیۆ چۆن دەنگ وەردەگرێ لە شەپۆلەکانی هەوا و دەیدات بە (سەماعە)کەی، خۆ ئەگەر ڕادیۆکە دەنگی نەما مانای ئەوە نییە ئیتر ئێزگە وەستاوە، یان شەپۆلەکانی کار ناکەن، چونکە لەوانەیە ڕادیۆکە وایەرێکی پچڕابێ و شەپۆلەکان هەموو تەواو بن، ئەگەر ڕادیۆیەکی تر بکەینەوە دەنگەکە وەردەگرین.

بیرەوەری (ذاكرة) بریتییە لە وێنە، بیرکردنەوە، بینینێکی سەربەخۆ، نیشتەجێگەی گیان (روح)ە، نەك مێشك، یان هەموو لەش، مێشك تەنها هۆیەکە بۆ گواستنەوەی ئەم وێنەیە بۆ ئەوەی لە جیهانی ماددیدا ببێتە چەند وشەیەکی کۆکراو و بیستراو.

وا بۆمان دەردەکەوێت ئێمە لە دوو هێزی گەورەو بچووك پێکهاتووین – لەش و گیان – نەك یەك هێز کە ئەویش لاشەو

مادده بێت و بەس، نەخێر، بەڵکو هێزی بچوك دەمرێ و دەگەنێ، دەڕزێ، کەچی هێزی گەورە بە بیرەوەرییەکەیەوە هەر دەمێنێ و لە جیهانێکی تردا دەژی، هەموو کردەوەیەکیش کە لەگەڵ لەش بووە و کراوە هەر لە بیری دەمێنێ.

کەواتە کاری مێشك تەنها گەیاندنە، ڕۆڵەکەشی بریتییە لە گەیاندنی جیهانی گیان بۆ جیهانی مادە، وەك (برجسۆن) دەڵێ: هێڵ دەگەیەنێ.

(کێبڵ)[21]ەکانی دەمار هێزی گیانمان بۆ دەهێنێ و دەیکات بە لێدانێکی ئەلیکترۆنی تاکو ماسولکەکانی زمان بیگۆڕێتەوە بە گفتوگۆ وەکو چۆن ڕادیۆ هەڵدەستێ بە گۆڕینەوەی شەپۆلەکانی ناو هەوا، بەم جۆرە ئەو وێنەیە لە دۆخی ئەندێشە (خەیاڵ)ەوە دەگوێزرێتەوە بۆ دۆخی هاتنە دی.

ئەگەر جەستەمان مرد دەبینەوە گیان.

لە دنیادا چرکە چرکە بیر لە کردەوەکانمان بکەینەوە، دەبینین هەموو پیت و کردەوەیەك تۆمار کراوە.

تیۆری زانستیش هەیە، کە لەمە زیاتر تێدەپەڕێ، کەوا ئەنجامەکە بریتییە لە کردارێکی بیرهێنانەوەی زانستێکی کۆنی

---

[21] کێبڵ ئەو وایەرە سەرەکیانەی سەر شێلمانەکانی جادەیە، کە هێزی سەرەکی کارەبا لەسەر مالأندا دابەش دەکات.

کۆکراوەو نوسراو لە گیاندا ئەوەنییە کە لەسەر تەختە ڕەشەوە فێر ببین کە ٢×٢= ٤، ئێمە لە نەبونەوە ئەمە بە دیار ناخەین، بەڵکو لەگەڵ لە دایکبونماندایە، هەرچییەك کە دەیکەین، تەنها ئەوەیە کە وەبیر خۆمان دێنینەوە، هەروەها ئەو شتانەی کە لە بیرکاری و ئەندازەو ژیربێژی دایە، گشتیان لەناوماندا کۆکراوەتەوە، ئێمە تەنها وەبیر خۆمانی دێنینەوەو پێکیان دێنین.

بەهەمان شێوە، کەسایەتیمان، کە لە گیانماندا هەیە، لەگەڵ لە دایکبونماندایە، هەموو ئەوەی کە ڕوو دەدات، ئەوەیە کە ڕووداوەکانی دنیا شپرزەیی و قاڵبی ماددیی پێشکەش دەکات، بۆ ئەوەی ئەم کەسایەتییە چاکەو خراپەی خۆی دەربڕێ، ئینجا کردەوەکەی لەسەر تۆماردەکرێ.

تۆمارکردنیش ئەو کارە نوێیەیە کە لە دنیا ئەنجام دەدرێ، لە حاڵەتی نیەتەوە بۆ حاڵەتی تێکەڵی و پێکەڵی.

ئایینەکانیش سەبارەت بەمە دەریانبڕیوە، کە قسە لەسەر تاوانبار لە دنیادا دوای تاقیکردنەوە بەجێ دەگات، ئەمەش کارێکە پێشتر خوا زانیویەتی، زانینی دەوردان نەك زانینی بە زۆرکردن (التزام)، چونکە خوا زۆر لە کەس ناکات گوناهو تاوان بکات، بەڵکو هەرکەسەو بە پێی سروشتی ناخی خۆی

هەڵسوکەوت دەکات، کەواتە کردەوەکەی بریتییە لە خودی خۆی، ئەمەش هیچ مانایەکی بەزۆرکردن (جبری) نییە، چونکە هەر ئەم سروشتە ناوخۆییە کە هەندێ جاریش نهێنیگیر (السریرة) و هەندێ جار دڵ، خوای گەورەش بە نهێنی (السرّ) ناوزەندی کردووە، کە دەفەرموێ: (یعلم السر وأخفی) واتە بە ڕازو نزمتر لە ڕازیش دەزانێ.

ئێمەش بەو گوزارشتەی، کە لە ناو خەڵکی باوە لە کاتی مردن، دەربارەی ئەمە دەڵێین: (نهێنی خوایی بەدەرکەوت، بە واتای گیان (روح) بەرەو بەدیهێنەری خۆی بەرز بۆوە).

ئەم نهێنییە سەرەتایەکی ئازادو دەست پێشخەرییەکە، خوا لە هەموو کۆتێك ڕزگاری کردووە، بۆ ئەوەی کردەوەکەی خودی خۆی بێ و حەزەکەی بەڵگەبێ لەسەری.

لە بواری مرۆڤایەتیدا، ناکرێ قسە لە شتە حەتمییەکان بکرێ، وەك حەتمیەتی ناکۆکی چینایەتی و ناچاریی مێژویی، چونکە مرۆڤ بوارێکی ئازادە، لە مەکینەدا بزمارو ئاسنێك نییە.

هەروا ناکرێ بزانی سبەینێ لە ژیانی تاکێك چی ڕودەدات، چونکە لە بواری کۆمەڵگاکان و مێژودا مەحاڵە کار بە سەپاندن یان زۆر لێکردن بکرێ، ئەوەندەی کە دەکرێ کاری پێ بکرێ

بریتییە لە پەسەند کردن و شیمانەکردن بە پێی پێشەکیی ئاماریی.

ئەمە پەسەندکردنێکە، کە هەڵە دەکات و دەپێکێ و لەهەردوولادا جیاوازی دەبێت، بۆ نموونە: لە ئینگلتەرا ڕێژەی تەمەنی مرۆڤ شەست ساڵە، ئەم ڕێژەیەش ڕێژەیەکی ئامارییە، کە لە ژمارە مامناوەندییەکان وەرگیراوە، مەرجیش نییە بۆ هەموو تاکێك ئەم ڕێژەیە جێگیر بێت، ڕەنگە تاکی وا هەبێت لە ئینگلتەرا زیاتر لە نەوەد ساڵ بژی و ڕێژەکە تێبپەڕێنێ، وەك بەرناردشۆ، ڕەنگە هەبێ بە هۆی ڕوداوێکەوە لە تەمەنی بیست ساڵییدا بمرێ، پاشان خودی ڕێژەکە لە هەردوو لایەوە لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر بۆ بەرزبونەوەو دابەزین لە بارە، کەواتە لەم بابەتەدا ناکرێ حەتمیەت و ناچار کردن (جبریە) بسەپێنین.

ناشبێ بواری مرۆڤایەتی چ تاك بێ یان کۆمەڵگە، یان مێژوو ملکەچی قاڵبێکی تیۆریی یان هاوکێشەیەك یان ژمێریاریی یان گریمانەیەکی فەلسەفی بکەین.

بەڵام ماددییەکان وادەزانن ئادەمیزاد بریتییە لە لاشەی بێگیان و بێ هۆش (عقل)، بێ ئارەزوو، بێ نەفس، وادەزانن (عقل و نفس) ئامێرێکی هەڵسوڕێنەری دەمارەکانن.

لەو واقیعەی دەبینرێ کە جەستە ملکەچی یاسا فسیۆلۆجییەکانە، بیریار (مفکر)ی ماددیی ئەنجامگیری دەکات، کەوا سەرجەم مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە یاسا ماددییەکان بەستراوەتەوە.

ئا بەم جۆرە مرۆڤ بە تۆپەڵ (کتلة)ێکی ماددی وەکو مانگ دادەنێن، کە بەهێزی گەردون و بێدەسەلاتی بە دەوری زەوی و خۆر خۆی دەسوڕێتەوە، ئیتر لە بیری خۆیان دەبەنەوە، کە ئادەمیزاد لە دوو ئاست دەژی.

ئاستی کاتیی (زمنی) دەرەوەی دانراوە، کە پێی دەوترێت کاتی کاتژمێر (زمن الساعة) و لەم کاتەدا بە ئەنجامدانی ژوانەکانی و بە پێویستییەکانی کۆمەلایەتی هەڵدەستێ و لەگەڵ یاسای زۆرکاریدا (الحتمیات) دەژی.

هەروەها ئاستە تایبەتییە ناوخۆییەکەی، کە کاتی هەست و کاتی خەوبینینە، دەبینێ و داهێنان دەکات و لەبەرامبەر کۆمەڵگەو مێژودا هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە دەنوێنێ، بەڵکو دەتوانێ ئەم شۆڕشە ناوخۆییە بۆ کارێکی دەرەکی بگوازێتەوە کە کۆمەڵگە وەرچەرخێنێ و لە بناغەوە مێژوو بگۆڕێ، هەروەك لە گشت شۆڕشە پێشکەوتنخوازەکاندا ڕویدا.

هەر ئەم ژیانە دوو ئاستە، سیفەتێكە كە مرۆڤ پێی تایبەتمەندە، ئەم نەفسەش كە هەیەتی چەند سیفەتێكی هەمەجۆرو جیا لە سیفەتەكانی بێگیانی تێدایە.

كەواتە ئێمە لەبەردەم یەكە (وحدة)یەكین لە شوێندا درێژبونەوەی نییە، جێی سەرسوڕمان نییە، بیریارێكی خۆرئاوایی ئەڵمانی (عەمانوێل كانت)[٢٢] لە كتێبەكەی (نقد العقل العملي)دا دان بەم حەقیقەتەدا بنێ، هەروا جێی سەرسوڕمان نییە بەبێ ئەوەی قورئانی خوێندبێتەوە، بگاتە ئەم ئاكامە ساغو ڕاستە.

بەڕاستی ئەمە فیترەتو زیرەكییە كە گشت زانستەكانی لەسەری بەرپا دەبن.

پێویستیش ناكات عەقڵی ساغ كتێبی پیرۆز بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی بەدەریخات گیانی هەیەو دوای مردن ژیانی هەیەو لێپرسینەوەی هەیە، چونكە فیترەتی ساغ ڕێ ڕۆشنی خاوەنەكەی بۆ ئەم حەقیقەتانە دەكات.

ئەو نەفسە بریتییە لە (من)، كە بە ئامادەبونو بەردەوامی و كەسایەتیو بونو هەردەم هۆشیاری ناوزەد دەكرێ، پاشان

---

[٢٢] كانت فەیلەسوفێكی ئەڵمانییە، خاوەنی كتێبی (نقد العقل النظري ونقد عقل العملي)یە، ئەم زانایە دەڵێ گیان هەیەو مردنی بۆ نییە، ژیان بێ خوا نابێتو زیندوبنەوەی پاش مردن ڕاستە.

خۆی بەسەر واقیعی دەرەكیو گۆڕانكاریی كردنی دەسەپێنێ، هەروا خۆی بەسەر جەستەدا دەسەپێنێ و جڵەوگیری دەكات و بەسەر پێویستییەكانی بەرز دەبێتەوە بەسەرپشك كردن، نەخواردنو لەخۆگرتنەوە، بێبەش كردنی بەسەردا دەسەپێنێ، ڕەنگە بە گیان فیدایی‌و قوربانیدانەوە بەرەو مردن ڕاپێچی بكات، چەشنی ئەم نەفسە ناكرێ تەنها بەرهەمێكی لاوەكی بەرهەمەكانی جەستەو پاشكۆیی بێت‌و ماددەیەك بێت كە پێشی كەوتبێتەوە، ئەم جۆرە تیۆرە ماددیانە هیچ شتێكمان بۆ ڕاڤە ناكەن.

دەبێ بەڵگەنەویست بێ، كە ئەم نەفسە بەسەر جەستەدا بەرزەو جیادەبێتەوە و بەسەریاندا زاڵە، لە ڕاستییدا جەستە وەك ئامرازێك بۆ مەبەستەكانی نەفس بەكاردەهێنریت‌و ژێر بارێكە بۆ ئامانجەكانی، هەروەك ژیریی (عقل) مێشك وەك گەیاندنێك بەكاردێنێ.

هەردەبێ ئەو ئەگەرە (احتمال)ە ئاشكرا و دیارەمان بەزەین دابێ، كەوا ئەم نەفسە بە حوكمی كاكڵەو كرۆكەكەی كە هەستی پێ دەكەی ئامادەیەو بەردەوامە بە درێژایی كات هۆشدارە، نابێ وەك جەستە مردن‌و داخوران‌و داڕزانی بەسەردا بێت.

نەفس وەك جەستە داناخورێ، وەك مووی قژ ناوەڕێ و وەك ددان ناڕزێ و ناكەوێ.

شتێكی بەڵگەنەویستە و دیارە كەوا بزانین دوای مردن دەمێنێ گەر لە هاودەمی كردەوەكانمان ڕابمێنین، هەر لە دوو دڵییەوە بەر لە هەڵبژاردنی بڕیارێك، پاشان لە كاتی كاركردن، هەست بە بەرپرسیاریێتی، ئینجا دوای تەواوبونی پەشیمان بونەوە، یان پشوودانە، جا لەوكاتەدا ئەوەمان بۆ دێتە ئەنجام كە ئێمە لە بەردەم حاڵەتێكی چاودێری (فطري) و بیرۆچكەیەكی حسابدار داین، هەروەها دەردەكەوێ كە هەڵەو ڕاستی هەیە ئێمە ڕاستەوخۆ و هەركە بە فیترەتەوە هاتووینەتە بون، دەزانین دادگەری و نیزام یاسای بونەو بەرپرسیاریێتی ڕێسا (قاعدة)یە.

ئەم هەستە فیتریە ناچارییە پێمان دەسەلمێنێ، كە ئەو ستەمكارەی لە سزای سەر زەوی ڕزگاری دەبێ و ئەو بكوژەی لە لێپرسینەوەی یاسای مرۆڤكرد ڕزگاری دەبێ، هەردەبێ سزا بدرێ و لێی بپرسرێتەوە، چونكە ئەو جیهانەی تێیدا دەژین گوزارشت لە نیزامو ڕێكوپێكی دەكات، هەر لە بچوكترین گەردیلەوە تا گەورەترین ئەستێرە، بێ هودەیی (العبث) تەنها لە عەقڵ و یاسا لاڕێكانمانەوە بونی هەیە.

بیرۆچکەی دادگەریی و نیزام و پێویستی دادگەریی بەرەو پێویستی جیهانێکی ترمان دەبات، کە دادگەریی و نیزام و لێپرسینەوەی تێدا ئەنجام دەدرێ.

هەموو ئەمانە زانستێکە لەگەڵی لەدایکبووین، ڕاستییەکیشە کە فیترەت و بەڵگەنەویستی دەیسەلمێنێ.

ئەم زانستەو ئەو بەڵگەنەویستیەی دەیهێنینە کایەوە دەبێتە گەواهی لەسەر گشت زانستە وەدەستکەوتووەکان و هاودەمە لەگەڵیدا، هەموو زانستە وەدەستکەوتووەکانیش دەکرێ هەڵەو ڕاست بن، بەڵام ئەو زانستەی دەیهێنینە کایەوە بەشێکە لە سیستمی گەردونی پتەو و قوڵ، ئەم زانستە بریتییە لەو یەکەم ڕاستییەی کە لەبەر ڕۆشناییەکەیەوە گشت ڕاستییە ناسەرەکییەکان دەبینین. ئەم ڕاستیەش پێوەرو پێوانەیە جا ئەگەر پێوەرەکە تێکچوو، هەموو شتێک تێکدەچێ و هەموو شتێک دەبێتە بێهودەو بەفیرۆچوون، ئەمەش کارێکی ڕاست نییە.

ئەگەر بەڵگەنەویستی و بێ لێکدانەوەمان تۆمەتبار کرد، ئەوا گشت زانست و زانیارییەکان پەنجەی تاوانبارییان لەسەر هەڵدەگیرێ و دادەڕوخێن، چونکە لە بنەڕەتدا لەسەر بەڵگەنەویستە سەرەتاییەکان بەرپا بووە.

ئێمە لەبەردەم بنەڕەتێکی زانین و سەرچاوەیەکداین، کە گومانی تێدا نییە (چونکە ئەم سەرچاوەیە هەروەك خودی ژیانە) ئێمە لەبەردەم پشتێکداین، کە خوێن و گۆشتی زانینە.

ئێمە کە دێینە ناو ژیان ماسولکەمان پێدراوە، تا بە هۆیەوە بجوڵێین و بەرگریی لە خۆمانی پێ بکەین، هەروەها هەر کە لە دایك دەبین، بەڵگەنەویستە سەرەتاییەکانمان پێدراوە تا ڕەوا لە ناڕەواو ڕاست و ناڕاست جیا بکەینەوە.

بەرزترین پلەی زانستیش ئەوەیە کە لە ناختەوە بۆت دێت، بۆ نموونە: بێئەوەی تەماشای خۆت بکەیت، تۆ دەزانی لە چ بارێکدای (ئایا وەستاوی یان دانیشتووی یان پاڵکەوتووی).

ئەم هەستەت بۆ دێت لە کاتێکدا تۆ چاوت نوقاندووە، لە ناختەوە بۆت دێت. ئەم زانینەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر هەر چ شتێك کە دەبینرێ.

کاتێك دەڵێی، بەختەوەرم، بەدبەختم، ئازار دەچێژم، قسەکەت بەڵگەیەکی بەهێزە و ناکرێ بە بەڵگەیەکی مەنتیقی بە درۆ بخرێتەوە، بەڵکو بەراوردکردنی ئەم کارە بە ژیربێژی (منطق) زێڕەڕۆیی و پێداگیرییەکی بێ مانایە، هیچ کەسێکیش وەك خۆت بە خودی خۆت شارەزا نییە.

بە هەمان وێنە شەهادەی فیترەت و حوکمی بەڵگەنەویستی بەڵگەیە لەوپەڕی ئاستدا.

کاتێکیش دەڵێی: فیترەت و بەڵگەنەویستی بە زانست و فیکرو رامان (تأمل)ەوە پشت ئەستوورە، کاتێك باس لە گیان و نەفس و سەربەستی و بەرپرسێتی و لێپرسینەوە دەکەیت، کاتێك باسی هەڵسوڕان دەکەن لەسەر ئەو بنەڕەتەی کەوا لە گەردوندا ڕێك و پێکی هەیە.

ئا لێرەدا ئێمە لەبەردەم ئەوپەڕی ئاستی یەقینین.

یەقینێك وەك یەقینی بەچاو دیتن، بەڵکو زیاتریش.

فیترەت وەك چاو، ئەندامێکە لەگەڵی لەدایك دەبین، یەقینێکە بەرزتر لە یەقینی زانست، چونکە ڕاستکاری زانستی بریتییە لە ڕاستکاری ئاماری (إحصائي) و تیۆرە زانستییەکان، کە لە ناوەڕاستەکانی ژمارە ئەنجامگیری دەکرێت، بەلام حوکمی بەڵگەنەویستی سیفەتی بڕەرو ڕەهایە، کە دەڵێین ٢×٢=٤ بەڕاستی و ڕەهایی ڕاستییەکی ڕەهایە و ڕاستکارانەیە، نابێ لە تیۆرەکانی زانست، سڕینەوەو پێشکەوتن و گۆڕانکاری بەسەردا بێت، چونکە قسەیەکی بەڵگەنەویستە، کە دەڵێین ١+١= ٢، ئەمە هیچ گومانێك هەڵناگرێت، چونکە ڕاستییەکە فیترەت خستویەتیە ناخمانەوەو بەڵگەنەویستیشە.

ئەمە زانینی سەرەتاییە كە لەگەڵ بڕوانامەی لەدایكبوندا بۆمان هاتووە.

گەر مرۆڤ ئەمەی بزانیبا دەحەسایەوە، لە مەسەلەی گیان و جەستەو عەقڵ و مێشك و ئازادی و ناچاركاری و بەرپرسێتی و لێپرسینەوەشدا دەمە دەمو زۆربڵێی و بێبەڵگەیی و خۆبەگەورە زانینی زۆری بۆ خۆی زیاد نەدەكرد، ئەوەندەش بەس دەبوو گوێ بگرێ لەوەی كە فیترەت و دڵی خۆی بە گوێیدا دەچپێنن و گوێڕایەڵی ئەوە دەبوو، كە بەرچاوڕوونییەكەی ڕێی نیشان دەدات.

گەردیلەیەكیش لە لێبڕان (اخلاص) باشترە لە زۆرەها كتێب.

با بە لێبڕان و ئیخلاسییەكی زۆرەوە گوێبیستی دەنگی دەروونمان و چرپەی بەرچاوڕونیمان بین، بەبێ هەوڵدان بۆ شێواندنی ئەو دەنگە نوێیە، ئەویش بە ژیربێژی و بەڵگەوە دێتە ئەنجام.

هەركەسێكیش لە قسەكەم بە گومانەو ئارەزووی دەمە دەمو موناقەشەو قسەی ژیربێژین، با بگەڕێینەوە سەر وتارەكەم و هەر لە سەرەتاوە بیخوێنێتەوە.

## - دادگەری هەمیشەیی :

ئەو کەسەی پشیلەیەك ببینێ کە بزە بزێتی بە دەوری سینی نان خواردن دا تاکو لە خافڵێ بتوانێ پلێ گۆشت بدزێت، ئەگەر لەم کاتەدا سەیری چاوی ئەم گیانەوەرە بکەین ئەبینین پشیلەکە هەست بە تاوانی دزێتی ئەکات و خۆی بە تاوانبار دەزانێ هەرگیز لە بیری ناکات.

پشیلە گیاندارێکی بێ فامە، کەچی هەست بە تاوان دەکات لە دزێتی ئەو پلە گۆشتەدا، ئەگەر تاکە پێلاوێکی بەرکەوت چاوی دەنوقێنێ و سەرڕادەوەشێنێ وەکو بلێی تۆڵەی تاوانەکەی وەرگرتووە.

هەستێکی سروشتی سەرەتاییە، کە خوای گەورە خستوویەتییە بونیەی دروستکراوەکانی هەتا لە گیاندارە بێ زمانەکانیشدا هەیە.

هەر ئەو پشیلەیە چاڵ هەڵدەکەنێ بۆ ئەو پیسییەی کە کردویەتی، تا بشارێتەوە، هەست دەکات بەوەی کە ئەوە پیساییە و نابێ بە بەرچاوەوە بێت، بێ ئەوەی کەس فێری بکات.

ناسینەوەی بەچکەی گیانلەبەر بۆ دایکی، هێرشبردنی شێر بۆ مژینی خوێنی نێچیرەکانی، خوشەویستی نێرو مێی کۆتر، ئەمانە هەمووی هەستی سروشتین.

هەروەها ئێمەش ئەگەر کردەوەیەکی ناڕەوا بکەین هەست بە پەشیمانی دەکەین، ئەگەر کردەوەی چاك بکەین هەست بە پشوو دڵنیایی دەکەین، چونکە هەر ئەو دروستکەرەی کە خۆمانی دروستکردوە ئەم هەستەشی تێدا دروستکردوین تاکو بتوانین بەم هەستە بە یاساو بە کردەوەی جوان هەڵسین.

وەکو هەموو دروستکراوەکانی جیهان هەر لە بچوکترین دروستکراوەوە تاکو گەورەترینیان، هەریەکە بە پێی یاساو بەڕێکوپێکی هەڵدەستن بە کاروباری خۆیان.

ئەلیکترۆن ناگوێزرێتەوە لە خولگەیەکەوە بۆ خولگەیەکی تر هەتا هێزێکی نەدرێتێ، کە بگاتە ئەندازەی گواستنەوەی، وەکو چۆن سواری شەمەندەفەر نابیت تاکو بلیت نەبڕیت.

پەیدابونی ئەستێرەو مردنی، یاساو هۆی تایبەتی هەیە.

وەکو چۆن کشانی بە هۆی پاڵەپەستۆی کێشەر (جاذبیة)وەیە.

گۆڕانی ماددە بۆ هێزی وزە (طاقة) و گۆڕانی لاشەی هەتاو بۆ تیشك هاوکێشەی هەیە.

گواستنەوەی ڕوناكی خێرایی هەیە.

هەموو شەپۆلەكانی هەوا درێژی و لەرە لەرو خێراییان هەیە.

هەموو كانزایەك كە دەكشێت یان كورت دەبێتەوە بە پێی گەرما و سەرمایە، هەموو كانزایەك تۆپەڵ و چڕی و كێشی گەردیلەیی و نەگۆڕیی و خاسیەتی هەیە.

ئەنشتاین بۆی سەلماندوین، كە پەیوەندی لە نێوان جەستەو خێراییەكەیدا هەیە.

هەروەها لە نێوان كات و سیستمی جولانەوە لەناو كۆمەڵەیەكی جولاو هەیە.

هەروەها پەیوەندی لە نێوان كات و شوێن هەیە.

ئەوەی كەرەستەكان بۆ بێ گیانەكان و شلەمەنی و گازەكان جیا دەكاتەوە، ڕێژەی خێرایی نێوان گەردیلەكانیەتی.

لەبەرئەوە گەرمایی لەم خێراییە زیاترە، دەتوانێ ماددە بێ گیانەكان بتوێنێتەوە و بیگۆڕێ بۆ شلەمەنی، پاشان بە هەڵمبونی شلەكان و گۆڕانی بۆ گازەكان.

هەروەها كارەبا بە چەند یاسایەك دەكەوێتە كار.

هەروەها هێزی ڕاكێشانی هەر ئەستێرەیەك لەسەر ئەندازەی تەن و تۆپەڵەكەی دەوەستێ.

ئەو بومەلەرزەیەی بە چەند جۆر ئاژاوە دەنێتەوە، ئەویش دیسان سیستەمو پشتێنەو هێڵی هەیە، کە دەکرێ بە درێژیی و پانایی زەوی نەخشە بکێشرێ.

گەردون هەمووی خشتەی چەند یاسایەکی ڕێکوپێکە ، نە دزی تیایەو نە تەڵەکە.

کەچی دەنگێك لێرەدا بەرز دەبێتەوە و دەڵێ: ئەی بۆچی ئێمە ژیانمان پڕە لە فڕو فێڵ و تەڵەکە و خوێنمژین و شەڕوشۆڕ، ئیتر یاساو داد لە کوێن ؟

منیش دەڵێم: ئەمە شتێکی ترە، ئەم کردارە ناڕەوایانە هەر لەناو ئێمەی ئادەمیزاددا هەیە، چونکە ئێمە دانراوی تایبەتی خوا بوین لەناو هەموو گیانلەبەرانی تردا. هەڵبژێرراوین و کراوین بە خەلیفە[23]، سەربەستی پێدراوین. ئەو ئەمانەتەی[24] بۆ ڕانواندین و ئێمەش پێی ڕازی بووین.

مانای ئەو سەربەستییەی پێمان دراوە ئەوەیە کە دەتوانین کاری ڕاستو هەڵە بکەین.

---

[23] (ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلاَئِفَ فِي الأَرْضِ) (يونس: ١٤). (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً) (البقرة: ٣٠).

[24] (إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً) (الأحزاب: ٧٢).

ئەم کردەوە ناڕەوایانەی دەقەومێت هەموی هۆی ئەم سەربەستییەیە، کە نەمانزانی چۆن و کەی بەکاری بهێنین.

کەواتە پشێوی و ئاژاوە، تاوانی ئێمەیە، لە ئاکامی سەربەستییەکەماندا، بەڵام جیهان لەوپەڕی ڕێکوپێکی دایە.

خوا دەیتوانی بە زۆر بمانهێنێتە ژێر باری دادو یاساوە، وەکو چیاکان و دەریاکان و ئەستێرەو... هتد.

بەڵام ویستی ناچاریمان لەسەر لاببات، تا دادپەروەرییەکەی بە ئەنجام بگات و هەریەکەمان کردەوەی خۆمان بخاتە دەستی خۆمان و بە کردن و نەکردنی تاکو لە جیهانێکی تردا بە دادپەروەریی هەریەکە بە پێی کردەوەی خۆی پلەو شوێنی خۆش یان ناخۆشی بداتێ.

ژیان نەبڕاوەیە، ئەمە هەموو ژیان نییە، کە ئێمە لە جیهاندا بەسەری دەبەین.

بەڵکو ئەمە ماوەیەکی پڕ لە ئاژاوەو بێدادییە، ماوەیەکە حیکمەت و هۆی خۆی هەیەو ئەوەشە دادگەریی، ئەم ماوەیە پڕە لە تاقیکردنەوە بۆ چۆنیەتی ژیانی هەتاهەتایی دوایی.

ئەم ژیانی دنیایەمان هەموو چیرۆکەکە نییە، بەڵکو باسێکی بچوکە لەو چیرۆکەدا، لە پاشان هەزاران باسی بە شوێندا دێت.

ئادەمیزاد هەر بە خۆڕسكی ڕاستی زیندوبونەوەی بۆ دەركەوتووە.

مرۆڤی سەرەتاییش ئەم ڕاستییەی زانیوە.

هەروەها هەموو پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لێبێ) هەواڵیان بەمە داوە.

هۆش (عەقڵ) و زانست، هەستیان بەمە كردووە كە مرۆڤ لاشەو گیانە (وەك لە پێشەوە باسمان كرد)، ئادەمیزاد بە هۆی گیانەوە هەست بە هەموو چپەیەكی ناوخۆیی دەكات، هەزاران تاقگەی گۆڕانی جۆربەجۆر بڕژێتە سەری، هەر هەست دەكات كە بونی ناوخۆیی بالادەست ترە لە مردن و نەمان.

زۆر لە فەیلەسوفەكانی جیهان دانیان بە زیندوبونەوەدا ناوە، وەكو (عەمانوێل كانت) و (برگسون)[٢٥] و (كیركجارد)[٢٦].

لە پەڕاوی (كۆماری ئەفلاتون)[٢٧] دا باسێكی زۆر جوانی تێدایە لەبارەی نە مردنی گیانەوە.

---

[٢٥] برگسون لە ساڵی ١٨٥٩دا لە دایك بووە لە ١٩٤١دا مردووە، فەیلەسوفێكی گەورەی فەرەنسەیە، زۆر دانراوی هەیە دژی ماددیەكان و باوەڕی بە نەمردنی گیان بووە، خاوەنی كتێبی (المادة والذاكرة) و (التطور والأخلاق) و (المحاولة في درس أوضاع الوجدان)و .... هتد.

[٢٦] كیركجارد فەیلەسوف و لاهوتی دانماركی بوو، خاوەنی كتێبی (الغصة)یە، باسی زیندوبونەوەی تێدا كردووە.

كەواتە گیان ڕاستییەكە خۆی بەسەر گەورەترین و بچوكترین عەقڵدا دەسەپێنێ و بەڵگەنەویستێكە، زەحمەتە نكوڵی لێ بكرێ.

بەلام لای من گەورەترین بەڵگە بۆ زیندوبونەوەی پاش مردن[28] ئەو هەستە نهێنییەیە كە پێمان دەڵێت یاسایەكی تر هەیەو دادگاو دادپەروەریی هەیە.

ئێمە هەموو كاتێك هەوڵ دەدەین و بە خەڵك دەڵێین بۆ ئەم دادپەروەرییەی كە هەیەو خۆمانی بۆ دەدەین بە كوشت و كوشتار دەكەین بۆ زیادبونی لایەنگرانی دادو لە ڕێگای دادپەروەریدا دەمرین، كەچی ناگەین بەو دادە؟

ئەمە مانای ئەوەیە هەردەبێ ڕۆژێك دادپەروەری تەواوی تێدا بێتە دی، چونكە ڕاستییەكی ڕەهایەو خۆی بەسەر عەقڵ و دڵ و دەرونماندا سەپاندووە.

ئەگەر ئەم دادپەروەرییەش لە جیهانی ئێمەدا نەیەتە دی لەبەرئەوەیە ئێمە سەرجەم وێنەكە نابینین و ئەم جیهانەی ئێمە هەموو ڕاستییەكە نییە، ئەگینا بۆچی لە كاتی بینینی ستەمێكدا

---

[27] كۆماری ئەفلاتون: پەڕاوێكە دانراوی ئەفلاتونە، تێیدا باسی دادپەروەری و ژیانی كۆمەڵایەتی دەكات، دان دەنێ بە زیندوبونەوەی پاش مردن، مامۆستا شاكر فەتاح كردویەتی بە كوردی.

[28] سەرەرای خەوتن و لە خەو هەستان وەكو لە پێشەوە باسمان كرد.

دڵمان ئاگر دەگرێ، بۆچی هەردەم داوا لە کەسانی تر دەکەین دادگەر بن.

بۆچی هێندە سوور دەبین و لەسەر شتێکی نەبوو زۆر تووڕە دەبین؟

بیریاری هیندی (وحید الدین خان) دەڵێ: چۆن تینوێتی مانای بونی ئاوە، هەروەها تینوێتی دادپەروەری مانای بونی دادە، لەبەرئەوەی دادپەروەری تەواو لە دنیادا نییە، مانای ئەوەیە جیهان و ڕۆژێکی تر هەیە کە دادپەروەری تەواوی تێدا بێت.

هەستی ناوخۆیی ڕاستترین بەڵگەیە بۆ بونی دادی ڕاست، با ئێمە ئەمڕۆش نەیبینین، ڕۆژێك هەردەبێ بیبینین، ئەمە ڕاستییە، چونکە لە شوێنێکەوە ئەم هەستە دێت کە کەس هێزی بەسەردا نییەو دوورە لە گزی و درۆکردن، ئەمە یاسایەکە لەو یاسا ڕێکانەی ئەم جیهانەی هێناوەتە دی.

لێرەدا دەنگێك بەرز دەبێتەوە و دەڵێت: واز لە ئادەمیزاد بێنە، ئەی بۆچی خوا بەرازی بە بەرازو سەگی بە سەگ و مێرووی بە مێروو دروستکردووە ؟ بۆ ئەبێ لەم شێوە ناشیرینەدا دروست بکرێن ؟ ئیتر دادپەروەری خوا کوانێ؟ گەر خوا گیانلەبەرێك

زیندوو دەکاتەوە، ئەدی بۆچی مەیمون و سەگ و بەراز زیندوو ناکاتەوە ؟

پرسیارەکە جوانە ، بەڵام هۆشی ئێمە نەك نیوەی پەرتوکەکە، بەڵکو دێڕێك لەو پەرتووکە گەورەیە بە تەواوی نازانێت ، وێڕای ئەمەش پەلە لە زانینی حیکمەت و هۆیەکانی دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕاستییدا هەموو گیانلەبەرێك خاوەنی نەفسە، خواش بۆ هەموو نەفسێك جۆرە بەرگێکی داڕشتووە کە شایانی ئەو نەفسە بێت، بۆیە بەرازی بە بەراز دروستکردووە، چونکە بەرازە.

بۆ ئەو بەرازەش داڕێژە (قالب)ێکی ماددی بەرازی بۆ دروستکردوە، بەڵام ئێمە هیچ لەو نەفسە نازانین پێش ئەوەی خوا بیخاتە ئەم قاڵبی بەرازییەوە، نازانین هۆی دروستبونی بەم جۆرە چییە؟ چونکە پێش بونی شاراوە بووە وەکو پاش مردنی شاراوەیە.

ئێمەو هەموو دروستکراوەکانی تری جیهان، لە جیهانێکی تردا بووین کە پێیان ئەوت (عالم الذر)، پاش مردنیش لە جیهانێکی تردا دەژین کە پێی دەوترێ (پاشەڕۆژ)، ژیان نابڕێتەوە و مردن نییە، مردن بریتییە لە گۆڕینی بەرگ و شێوە و

تێکۆشان بۆ لای خوا، ئەوەش بە خۆماندوو کردن و خەبات، ئەم بەردەوامیەش هۆش (عقل)یش دانی پێدا دەنێ.

کەوابوو دادپەروەری ئەو ڕاستییە ئەزەلیەیە کە خوای گەورە لە فیترەت و لەناو مرۆڤدا دایناوە، تەنانەت لە ناخی ئاژەڵیشدایە، هەروەك لە سەرەتای وتارەکەمەوە نووسیومە.

هەر ئەم دادپەروەرییەیە دەڵێ: هەموو ئەم قاڵبانەی کە بۆ گیانلەبەران و دروستکراوەکانی تر دانراوە هەمووی بە پێی شیاوی خۆیەتی، چونکە بەراز نەفسێکی هەبووە پێش دروستبونی خواش قاڵبێکی بەرازی بۆ دروستکردووە.[٢٩]

بەڵام لە بابەت زیندوبونەوەی ئەو گیانلەبەرانەی تر (جگە لە ئادەمیزاد) قورئان دەفەرموێت:

{ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ } (الأنعام: ٣٨).

واتە: هەر زیندەوەرێ لە زەویدا دەڕوات و هەر مەلێ بە باڵ دەفڕێ، هەموویان کۆمەڵانێکن وەکو ئێوە، ئێمە لە ناو ئەم کتێبەدا هیچ شتمان هەڵنەبواردووە، لە دواڕۆژیش گشت ئەمانە لە لای پەروەردگاری خۆیان کۆ دەکرێنەوە.

---

[٢٩] لێرەدا مامۆستا شێخ عەبدولعەزیز پارەزانی نیشانەی پرسیاری بۆ داناوە.

ئەمە مانای ئەوەیە هەموو گیانلەبەرەكانی تریش زیندوو دەكرێنەوە وەكو ئێمە، بەڵام لە پاشدا چییان لیّ دەكرێت و بۆ كویّ دەچن؟

ئەمە نادیار (غیب)ە، ئێمە لە تەمەنی دنیاماندا ناتوانین دەرك بە هەموو شتێك بكەین و بیزانین، چونكە زانینی هەموو شتێك مەحاڵە.

بەڵام گەر ئەوەندە زانینەی دەیزانین، گەر ئەوەندەی بە تێڕامان بە دەستمان هێناوە، كەوا دادگەری ڕاستییەكی هەمیشەیی (أزلی)یە، خوای گەورە خستوویەتییە فیترەتەوە، ئەوا زۆرمان زانیوەو بەوەندە گەیشتووین، كە بەشمان بكات، بەو شێوەیەی كە لە وتاری یەكەممان خوامان لیّ ناسیی، كەوا خوای گەورە هەر خۆی بە تواناو بەدیهێنەرە كە گرنگی بە دروستكراوەكانی دەدات، ئا بەم شێوەیە تێدەگەین خوای گەورە چۆن ئەم فیترەتە ڕێنوێنییە دەخاتە ناو دروستكراوەكانی، ئەمەش لە خوازیارەكانی گرنگیدان و دادگەرییەتی، كەوا دروستكراوەكانی دروست بكات و ئەم ڕۆشناییەیان بۆ دروست بكات، كە شارەزای ڕاستە ڕێی پیّ دەبن، هەروەها باوەڕ دەكەین كە خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانە كردووە و كتێبی ناردووە، كەواتە بەبیّ ئەمە خوا نابێتە پەروەردگارو نابێتە خوایەكی

ئیلهامـــدەر و هەڵســـوڕێنەر، بەڵگــەشمان لەســـەر ڕاســـتگۆیی کتێبـەکانی ئاسمـانی بریتـی دەبێ لـەو زانستو نادیـار (غیب)و حیکمـــەتو یاســـاو حەقـــەی بۆمـــان دێنـــێ، کـــە بـــە کۆششـــی تاکەکەسی و هەوڵدانی کەسێتی ناهێنرێتە کایەوە.

کــە دەگــوترێ خــوای گــەورە دادگــەرە و دروســتکراوەکانی دروستکردووە و ڕێگـای ڕاسـتی پیشانداوە (ئا ئەوە ناوەڕۆكو کرۆکی سەرجەم ئاینەکانە).

یەکەم ڕێبازە کە عەقڵ بەبێ ماندووبون پێی دەگاتو فیترەتـی پاك بە بەڵگەنەویستەوە ڕایدەگەیەنێ، ئەوپەڕی داهێنـان بریتییـە لە دان نەنان بەمەدا.

نکوڵیی کردنیش پێویستی بە کۆششێکی زۆرو پێچو پـەناو زۆربلێیـیو دەمـــەدەمی نـــەزۆکی هەیـــە، پاشـــانیش کۆتاییەکـــەی بەرەو کوێرە ڕێییە، چونکە لەسەر بنەڕەتێك دانامەزرێ.

هەروەها نەچێتە دەروازەی خۆبەگەورەزانی و کەللەڕەقییەوە وەك لـەوەی بچێتە دەروازەی تێڕامـانی بێلایـەنی پـاكو فیترەتـی ڕاست.

گەشـــتە درێژخایەنـــە فیکریەکـــەم هـــەر لـــە ســـەرەتای گەشتەکەیەوە لـە کتێبی (الله والانسـان) هـەتا دەگاتـە وەسـتانە

ملکەچییەکەی لەبەردەم دەروازەی قورئان و تەورات و ئینجیلدا هەر ئەمەی پێ گوتم.

بە دیدی من دینداری نییە ئەو کەسەی دەرمارگیرو حزب پەرست بێ و تێڕوانینی وابێ، کە هەر پێغەمبەری ئەو تاکە پێغەمبەرەو خوا پێغەمبەری تری نەناردووە، چونکە ئەم تێڕوانینەی بەرامبەر بە خوا تێڕوانینێکی مندالآنەو و دواکەوتوانەیە، پێی وایە خوا وەك سەرۆکی هۆزێك وایە، ئەم جۆرە هەست کردنە ڕەگەزپەرستییە نەك دینداری.

بەڕاستی تێڕوانینی ڕەوایانە بۆ خوا ئەوەیە کە خوا بەخشندەیەو بە هەمووان دەبەخشێ و پێغەمبەرانیش بۆ هەمووان دەنێرێ.

خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ: { إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ } (فاطر: ٢٤)

واتە: هیچ کۆمەڵێك نەبووە کە ترس وەبیرهێنیان بۆ نەنێردرابێ.

{ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا } (النحل: ٣٦)

واتە: بۆ ناو هەموو کۆمەڵەیەك پێغەمبەرێکمان بۆ بەرێ کرد.

{ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبۡعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولٗا } (القصص: ٥٩)

واتە: پەروەردگارت ئەو شارانەی قڕ نەکردووە تا لە نێو ئەواندا پێغەمبەری بۆ ناردون. { وَرُسُلًا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلًا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ } (النساء: ١٦٤)

واتە: پێغەمبەرانی دیکەشمان بەرێکرد، چ ئەوانەی کە لە پێشدابون و چوون و سەربوردەیانمان بۆ گوتوی و ئەوانەی کە دەربارەیان نەمدواندوی.

مانای ئەم ئایەتەی دوایی ئەوەیە کە لەوانەیە (بوزا) پێغەمبەر بووبێت لە کاتی خۆیدا، با ناوی لە قورئانیشدا نەبێت. یان (أخناتون) لە کاتی خۆیدا پێغەمبەر بووبێ، با لە قورئانیشدا ناوی نەبێت.

خوا دەیەوێ ئادەمیزاد هەر ئەو بپەرستن، بە پێی ئەو نامەیەی کە ناردویەتییە سەریان بێ جیایی و دووبەرەکی، دەبێ باوەڕیان ببێت بە هەموو نێرراوەکانی خوا، چونکە هەموویان لە بنەڕەتدا یەکن، هەموویان دەڵێن خوا یەکە، هەر لە ئادەم هەتا دواهێنەری پێغەمبەرایەتی (خاتم ﷺ).

باشترین نموونەی هۆشیاری ئایینی کراوە، بریتییە لە هۆشیاری پیاوێکی وەکو گاندی[٣٠] هیندۆسی لە کاتی

---

[٣٠] غاندی فەیلەسوف و تێکۆشەری هیندییە لە ساڵی ١٨٦٩ لە دایکبوومو لە ساڵی ١٩٤٨ز کوژراوە.

نوێژکردنیدا چەند دێڕێک لە قورئانو تەوراتو ئینجیلو داماباداى[31] ی دەخوێند، لەوپەڕی ترسەوە لە خوا و بە دڵێکی پڕ لە باوەڕەوە بە هەموو کتێبەکانی خواو باوەڕی بە خوای تاقانە هەبوو.

ئەم پیاوە ژیانی وەکو قسەکردنی وابوو، هەمووی خۆشەویستیو ئاشتیخوازی بووە.[32]

ئایینەکان لەلایەنی بیروباوەڕەوە هەموویان یەکن، با یاساکانیان جیاواز بن، وەکو چۆن خوای هەموویان یەکە، چاکەکاران لە هەموو ئایینەکاندا لەسەر یەک ئایینن.

چونکە دینداری ڕێزدار وا نازانێ کە خوای گەورە تەنها دروستکەری ئەو و ڕێنماییکاری ئەوە یان تەنها خوای کۆمەڵێکە، بەڵکو خوای گەورە ڕێنمونیکاری هەموو ئەهلی ئاسمانەکانو زەوییە، گشت کەس بۆی هەیە بە دوایدا بگەڕێو بیناسێ، ئەو خوایەیە کە بەخشندەو میهرەبانەو لەهەموو سەردەمێکدا پێغەمبەرو سروشی ناردووە.

---

[31] داماباداى هیندۆسییەکان دەڵێن کتێبی خوایە و ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەیان کە بوزا بووە.

[32] دیسان مامۆستا شێخ عەبدولعەزیز پاڕەزانی نیشانەی پرسیاری بۆ داناوە.

ئەمەش لە داخوازییەکانی دادگەریە ئەزەلیەکەی خوایە، ئا ئەمە مانای شیاوی پایەی خواییە، بەبێ ئەم ئیمان کراوەییە بابای دیندار نابێتە دینداری ڕاستی.

بەڵام ئەوانەی کە لەسەر یەك ئاینن و بەش بەش بون و یەکتری دەکوژن بەناوی ئایینەوە ئەوانە هەڵگری ئاڵای درۆو پروپاگەندەن و ئاڵای ڕەگەزپەرستی و دووبەرەکی بەناوی ئایینەوە دەشەکێننەوە، هەر لە نەزانینیەکەی کاتی (ئەوس و خەزرەج)[٣٣] بۆ خوا دەجەنگێن لە پەنای ئارەزوو ڕابواردنی خۆیاندا و واش دەزانن بۆ خوا دەجەنگێن: کەچی هەردوولایان خۆیان دەپەرست، نەك خوا.

خواپەرستی لە ناسینی خواو پایەی بەرزییەوە دەست پێدەکات.

ناسینی خواش لە خۆناسین و ناسینی نزمی و بێنرخی نەفسەوە دەست پێدەکات.

ئەمەیە تاقە ڕێگا بۆ گەیشتن بەوپەڕی ئامانج لە پاش کۆچکردن و لە جیهان دەرچوون.

---

[٣٣] ئەوس و خەزرەج دوو تیرەی عەرەب بوون لە مەدینەدا پێش ئیسلام بوونیان لە بەربەرەکانی و جەنگدا بوون لەگەڵ یەك، بەڵام بوون بە برا بە هۆی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

## ـ ئەی سزا بۆچی ؟

ڕۆشنبیران ڕەخنەیەکی سەرزارییان هەیە لەبارەی زیندوبونەوەی پاش مردن و سزای بێ تاوانبارەکان، دەڵێن: چۆن دەبێ خوا ئێمە سزا بدات، لە کاتێکدا ئێمەی خۆشدەوێ، چونکە دروستکراوی ئەوین.

ئەمە خۆی لەبیر دەچێتەوە کە کوڕەکەی خۆی زۆر خۆش دەوێت و کەچی سزاشی دەدات، بە لێدان و بێ پارەی دەکات و دەیبەستێتەوە، بەڵکو لەوانەیە داخی بکات.

تا زیاتر کوڕەکەی خۆش بوێت زیاتر گوێ دەدات بە پەروەردەو ئامۆژگاری و سەرزەنشتی.

ئەگەر گوێنەدات بە پەروەردەی کوڕەکەی خەڵك پێی دەڵێن باوکێکی بێ کەڵکەو گوێنادات بە کوڕەکەی.

خوا واتە پەروەردگار، جا دەبێ ئەو پەروەردگارە چۆن پەروەردەی ئێمە بکات.

وشەی (خوا ئێمەی خۆش دەوێ) وشەیەکی قوڵ و پڕ مانایە، زۆر کەس مانای بە تەواوی نازانێت، وادەزانێ خوا ئێمەی بە هەموو کردەوەیەکەوە خۆش دەوێت، نا ئەمە ڕاست نییە.

ئایا خوا زۆرداری خۆش دەوێ؟

نابێت مەحاڵە، نابێ خوا ستەم و زۆرداری خۆش بوێ.

چۆن خوا زۆردارو زۆرلێکراوی وەکو یەك خۆش دەوێ؟

ئەمە بۆ پلەی خوایی فەوزای فیکرییە.

دەبێت خوا بە دەسەلاتتر بێت لە هەموو زۆردارەکان و گەورەتر لە هەموو خۆبەزل گرەکان، بەهێزتر بێ لە هەموو بەهێزەکان، دەبێ خوا هەموو مرۆڤێك پلەی خۆی بداتێ.

هەر لەو هەموو یاسا جوانەی لە زەوی و ئاسماندا هەیە، بۆمان دەردەکەوێ کە خوا دادپەروەرە.

ئەو بەلگە ئاشکرایانەی لەبەر دەستمانن سیفەتی دادگەریی خوایی و رێکوپێکی و حیکمەت و دانایی دەسەلمێنێ و دووپات دەکاتەوە، بەلام ئەوانەی دان نانێن بە یاساو دادپەروەریدا ئەوانە پێویستییان بە بەلگە هێنانەوەو بەلگەی دان نەنانیان هەیە، نەك ئەوانەی بروایان بە یاسا هەیە، ئەوانەش هەرگیز دان بە سزادا نانێن و دان بەوەدا نانێن کە مرۆڤ خوایەکی هەیەو گەورەترین هێزو بەرزترین یاسای هەیە، من بانگی ئەو کەسانە دەکەم با بروانن حاڵ و باری جیهانی سەرزەویان، روانینێك لە دنیا، کە پێویست بە سەلماندنی دوایی نەکات.

دەڵێم نابێ رۆژێك ئەمانە (هیچ نەبێ) تووشی ددان ئێشەیەك نەبووبن کە دەڵێی سەریان بە مشار دادەهێنن لە تاو ژانی

ددانەکـە، یـان تووشــی ژانــی ڕیخۆڵـە کـوێرە یـان (سەراســیێ) نەبووبن.

با پرسیارێك لە ئێشی ئێسك شكاوی بکەن، ئیتر دەزانن ئەمە نموونەیەکی دۆزەخە.

نابێـت نـەزانێت جیـاوازی لـە نێـوان ئـەوەی کـە سـوتاوەو لـە خەسـتەخانە دەزریکینـێ لـە ژێـر دەسـتی پزیشـكو برینپێچـدا لەگەڵ ئەوەی کە لە تەنیشت خۆشەویستەکەیەوە لە گازینۆکانی (کۆڕنیش) لە قەراخ نیلەوە دانیشتووە.

سزاو ئازار ڕاستیەکی بەڵگەدارە.

ئـادەمیزاد دروسـتکراوی هێزێکـە کـە زۆر لـە ئـادەمیزاد بەهێزترەو بە هیچ جۆرێك ناتوانێ لە دەستی ئەو هێزە ڕابکاتو فرۆفێڵ کارناکات.

ئـــەم هێـــزە خـــاوەن باوەڕەکـــان پێـــی دەڵـــێن: (الله)و سەرلێشـێواوەکان پێـی دەڵـێن: (سروشـت) یـا (یاسـاکانی سروشت). ئەم هەڵاتنو خۆدزینەوە چییە ؟

مەگەر بێ بەڵگەیی قسەکردن بێت، بەڵام سەرلێشێواوەکانیش لێرەدا ناتوانن بڕوایان بەو هێزەو سزاکەی نەبێت.

بـۆ ئـەو خـاوەن هەسـتە ناسـکانەی ئـاخ هەڵدەکێشـن بـەو تێڕوانینـەی کـە خـوا زۆردارێکـی سـزادەر و ئازاردارە کـردەوەی

پاشایەکی تورکیان بیردەخەینەوە؛ کاتێ کە فەرمانی کوشتنی تاوانبارێکی بدایە شیشێکی نوك تیژیان دەهێناو سوریان دەکردەوە لە ئاگرداو زۆر بە هێواشی و لەسەرخۆ لە کۆمیەوە لێیان دەداو تا لە ملیەوە دەهاتە دەرەوە، هۆی هێواشی لێدانەکەشی ئەوەبوو تاکو زیاتر ئازار بچێژێ[34].

لەمەش زیاتر بۆ دیلەکانی جەنگ شیشیان سوور دەکردەوە لەناو ئاگرداو چاویان پێ هەڵدەکۆڵین.

ئەگەر بەندە ئا بەم جۆرە تۆڵە لە بەندە بستێنێ، ئەی خوا چی بکات ؟ وەکو ئێوە دەڵێن خۆشەویستین، دەبێ چاییمان پێشکەش بکات.

بەڵام نا، دۆزەخ ئەوپەڕی خۆشەویستییە، چونکە شتی تر نییە تاکو بەم جۆرە بەو کەسانە بسەلمێنێ کە خوایەکی دادپەروەر هەیە.

ئەمە دڵنەرمییە بەرامبەر ئەوانەی باوەڕیان بەو هەموو کتێب و نێرراوانەی خوا نەکردووەو هۆش و زانستیشیان بە دۆرخستەوە.

---

[34] سەیری کتێبی (المنجد في اللغة)و وشەی (خازوق) ل ١٧٢ بکە.

ئەمە کەی دادپەروەرییە خوا لە هیتلەر ببورێت، کە بیست ملیۆن کەسی لە جەنگێکدا دابەکوشت و هەزاران دیلی لەو ڕۆژەدا بە گاز کوشت؟!!

هەزارانی بە زیندویی سوتاندو لە ئەنجامدا لە کردەوەکانی ڕای کردو هەڵات.

تەنها بێ هودەیی و جیهان هەمووی هەر بێ هودە و بێ ئەنجام و فیڕۆ بێت، ئەوکاتە ئەو پیاوە بکوژە لە تاوانەکانی ڕزگاری دەبێ و سزا نادرێ.

لەم جیهانە ڕێك و پێکە جوانەدا هیچ شتێك لە دەورووبەرماندا نابینی، کە بەڵگەی بێ ئەنجامی و گاڵتەو بێ هودەیی بێت، هەموو شتێك هەر لە گەورەترین ئەستێرە هەتا وردترین گەردیلە گەواهی یاساو ڕێکوپێکی و پتەوی دەدات.

بابای ژیرو زیرەك و ڕاماو پێویستی بە فەلسەفە نییە بۆ زانینی مانای سزا، هەر بە سەیرکردنی ناوچەوانی تاوانبارەکان یان سەیری لاشەی کوژراوی بێتاوان، سەیری فرمێسکی زۆرلێکراوان و کەشخەی زۆرداران، پێویستی بونی سزای بۆ دەردەکەوێ.

مرۆڤ کاتێ پەشیمان دەبێتەوە، ئەنجا هەست بە سزاو لێپرسینەوە دەکات.

پەشیمانبونەوەش لە کاتی گوناهدا ئەوە دەنگی فیترەتە، هەروەها قیامەتی گچکەو دۆزەخی گچکەیە، نموونەیەکی ڕۆژی لێپرسینەوەیە.

ئەم پەشیمانییە ئەو گلۆپە سوورەیە لە دڵدایەو لە کاتی تاوانەکەدا دادەگیرسێ و دەکوژێتەوە، بە ڕەنگێکی سوور ئاگاداری خاوەنەکەی دەکات کە ئەم کردەوەیە لێپرسینەوەی لە شوێنە، ئەوەی لەسەر ڕاستی بێت دڵی هێمن و لەسەرخۆیە، ئەوەش تاوانبارە دڵی خەریکی تەپەتەپەو دەکەوێتە ناو ئاگری پەشیمانییەوە، هەندێ لەو سزایانە کە لە دنیادا تووشیان دەبین پەندە، بۆ سزای پاشەڕۆژ، ئەو سزایە چ بۆ یەك کەس بێت یان بۆ گەلێك.

ڕاونانی عەرەب لەلایەن جولەکەکانەوە لە (٥)ی حوزەیرانی (١٩٦٧) لە (سینا)[٣٥] دا پەندو وانەیە، سزا ژەنگی دڵان لا دەبات و بێگەردی دەکات.

---

٣٥ سینا، نیوەدورگەیەکە کەوتووەتە خوارووی دەریای سپی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی قەناتی (سوێس)ەوە، لە سەرەوەی دەریای سوورو لە ٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧دا جولەکە میسری داگیر کرد پاش شکاندنی عەرەبەکان بە هۆی بێ ئایینی و دەست پیسییانەوە.

هیچ کەس نەبووە (بەپێی خۆی) چ لە پێغەمبەرەکان، یان پیاوچاك، یان هونەرمەند، یان بلیمەت، کە سزا، یان نەخۆشی، یان نەبونی، یان دەربەدەری نەچەشتبێ.

بەڵام ئەم سزایە خۆشەویستییەو ئەو باجەیە کە مرۆڤ دەیدات بۆ بەرزبونەوەی پلەی بۆ پلەیەکی بەرزتر، خۆئەگەر هۆی بونی سزا بە تەواوی نەزانین لەبەرئەوەیە ئێمە هەموو شتێك نازانین و هەست بە هەموو شتێك ناکەین، ئێمە ئەم چیرۆکە نازانین بێجگە لە نازناوەکەی کە (دنیا)یە، بەڵام لە بەرو دوای نازانین، چونکە نادیار (غیب)ە، لەبەرئەوەیە کە دەبێ ئێمە بێدەنگ بین و لە خۆمانەوە یاسای درۆ دروست نەکەین.

ئێمە جۆری چۆنیەتی سزای پاش زیندوبونەوە نازانین، چونکە تا ئێستا لەو جۆرەمان نەدیوە نە پاداشت و نە سزای، ئەوەندە کە لە کتێبە پیرۆزەکاندا هاتووە تەنها هێماو ئاماژەیە، ئەمە وەکو ئەوە وایە کە منداڵێك نەزانێ ژن و مێردیی چییەو لە تامی جوتبونی ژن و پیاو بپرسێت، تۆ چۆنی پێ دەڵێین وەکو چی وایە، وەکو شەکر، وەکو هەنگوین، هەرچی پێ بڵێی ڕاست نییە، چونکە ئێمە لە فەرهەنگی ژیانی ئەودا وشەیەکمان دەست ناکەوێت کە بزانین وەکو ئەوە وایە، لەو تەمەنە کەمەیدا شتی بەسەر نەهاتووە و نەیدیوە کە تامی ئەوە بدات.

هەروەها بەهەشت و دۆزەخ بۆ ئێمە بەم جۆرەیە، لە ژیانی دونیادا شتی وامان نەدیوە لە خۆشی و ناخۆشی، بەڵام بە شێوەیەکی نزیکەیی کتێبە ئاسمانییەکان دەڵێن وەکو ئاگر، یان باخچەیەو بەناویدا جۆگەلەی ئاوی سازگار و شیرین و ئارەق و هەنگوین دەڕوات، ئیتر ئەوانەی باس دەکرێت وەکو ناهەمواری دۆزەخ و خۆشی بەهەشت هەمووی بیردۆزییە، چونکە تیایاندا هەیە ئەوەی چاوی هیچ ئادەمیزادێك نەیدیوەو بە دڵی کەسدا نەهاتووە، بەڵام ئەوەی کە ڕاستتر بێ لە هەمووی ئەمەیە:

دۆزەخ: نزمترین جێگەیە کە پڕە لە هەموو جۆرە سزایەك.

بەهەشت: بەرزترین جێگەیە کە پڕە لە هەموو جۆرە پاداشتێك.

سۆفیەکان دەڵێن: دۆزەخ جێگەی دوورە (دوور لە خوا) و پەردەیە لە نێو ئادەمیزاد و خوادا بۆ بڕینی بەزەیی، بەڵام بەهەشت جێگەی نزیکانە بە بەختیارییەك کە ناتوانرێ باس بکرێت .

{ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعۡمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلٗا } (الإسراء: ٧٢)، واتە: هەرکەس لەم جیهانەدا چاوی دڵی کوێر بێت لەو جیهانەی تردا کوێرترەو ڕێگەی زیاتر لێ تێکدەچێت.

لەو جیهانەی ئێستاماندا پلەی نێوان کوێرو چاوساغ وەکو شارەزاو نەزان وایە، بەڵام لەو دنیادا جیاوازییەکە گەورەتر دەبێت، وەکو قورئان دەفەرموێت: { ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا } (الإسراء: ٢١).

واتە: سەیرکە چۆن ڕێزی هەندێکمان داوە بەسەر هەندێکیاندا، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا پلەکان گەورەترو ڕێزەکان بەرزترە.

کەوابوو بڵێین ئەوەی کە لە پلەکانی خوارەوەیە وەکو ئەوەیە هەر لە ناو ئاگردا بێت و نەمرێت، بەڵکو خراپترە.

پاشەڕۆژ وایە، هەرکەسە هەقی خۆی دەدرێتێ و کەس لە پلەیەکەوە ناچێت بۆ پلەیەکی تر بە کۆشش و کردەوە نەبێت، بە تاقییکردنەوەو ناخۆشی ژیانی جیهانی نەبێت.

ئەمە ئەوپەڕی دادپەروەرییە کە هەموو ئادەمیزادێك پلەی شیاوی خۆی بدرێتێ، سزا بەم مانایە دادپەروەرییە، پاداشت بەم مانایە دادپەروەرییە، هەردووکیان بونیان پێویستە.

پۆڵا زۆر ڕەقە تەوری لێ دروست دەکرێ.

لاستیك دەکشێت تایەی لێ دروست دەکرێت.

پوش هەرزانە گسکی لێ دروست دەکرێت.

لۆکەی باش بۆ دروستکردنی پشتی بەکاردێت، لۆکەی خراپیش داوە دەرزی لێ دروست دەکرێ بۆ گرتنی بەلوعەی ئاو.

ئەمانە ڕوونن و پێویست بە هێنانەوەی فەلسەفە و بەڵگە ناکات.

هەروایە هەموو ئایینە ئاسمانییەکان پاک بوون و درۆ هەڵناگرن.

هەر لەبەر ئەمەیە کە هەر بە پاکی ئیسلام ماوەتەوە، وەکو تازە هێنەرەکەی ﷺ لە جیهان کۆچی دوایی کردبێت.

هەر لەبەر ئەمەیە کە سۆفییەکان دەڵێن: خوا پێویستی بە بەڵگە نییە بۆ ناسینی، چونکە خۆی بەڵگەیە بۆ دۆزینەوەی هەموو شتێک.

ئەو نەگۆڕەیە کە بە هۆیەوە گۆڕاوەکان دەناسین.

ئەو کرۆک و ناوەڕۆکەیە بە هۆیەوە جیاوازی دیاردەکان هەست پێدەکەین.

ئەو بەڵگەیە کە بە هۆیەوە حیکمەتی نەمانی جیهان دەرک پێدەکەین.

بەڵام ئەو عەقڵەی داوای بەڵگەی بونی خوا دەکات ئەو عەقڵە عەقڵی لە دەستداوە، ڕوناکیش شتەکانمان بۆ ئاشکرا دەکات و ڕێنمونیمان دەکات.

ناکرێ شتەکان ڕوناکیمان پیشان بدات، ئەگینا بارەکانمان وەرگێڕاوە.

وەك ئەوەی لە نیوەڕۆژدا بپرسیت: ئێستا ڕۆژە یان شەوە؟ بەڵگەتان چییە بۆ ئەوەی ئێستا ڕۆژەو شەو نییە؟

بەڵام ئەو هۆش و ژیرییەی داوای بەڵگە دەکات بۆ بونی خوا بێهۆشەو بەندبوەو پەردەی دڵی دڕاوە.

ئەوەی کە دەڵێ: پرسم پێنەکراو هاتمە جیهان و بە زۆر هێنامیان و کەچی لە پاشەڕۆژیشدا سزام دەدەن لەسەر تاوانەکانم سەرەڕای ژیانی ناخۆش و جیهانی پڕە لە چەرمەسەری، ئەم خاوەن پرسیارە وەك ئەو هونەرمەندە وایە کە هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی شانۆگەرییەك لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی تردا. ئەم هونەرمەندە دەوری یەکێك دەبینێت کە لێدان دەخوات و توشی ناخۆشی دەبێت لەبەردەم دانیشتوان و سەیرکەراندا، ئەگەر ئەم هونەرمەندە ئەو ڕێکەوتنە پێش هاتنە سەر شانۆکەی لە یاد بچێت دەبینی لێرەدا نارەزایی خۆی لە پێش چاوی سەیرکەران دەردەبڕێت و ناهێڵێ لێی بدرێت و دەورەکەی خۆی بەسەر نابات و دەڵێ: من تاوانم چییە لە پێش ئەم خەڵکە لێم دەدەن؟

ئیتر ئەوەی لەبیر دەچێت كە پێش ئەوەی بێتە سەر شانۆكە رێكەوتنی هەبووە لەگەڵ دەرهێنەری شانۆگەرییەكەو ئەمیش ئامادەیی تێدا بووە و هەستانی بەو دەورەو پەیمانێك بووە لە نێوانیاندا كە هەستێت بە جێبەجێ كردنی ئەو داوایانەیان، ئەم رێكەوتنەیان بووە پێش چوونە سەر شانۆو لە كاتی سەربەستی وتووێژدا، بە دڵ ئەم دەورەی وەرگرتووەو هەوڵیداوە پێش هاتنە سەر شانۆكە پەراوەی (چەند جار) بكات، بەڵام ئەمانە هەمووی لەسەر شانۆكە لە بیر چوویەوە، ئا لێرەدا ئەوەی لە ژیانیدایە لە ئەرك و ماندووبون و ئازارەوە دەگۆڕێ بۆ نیشانەی پرسیارو مەتەڵ.

ئەمە وەكو ئەو كەسە وایە وابزانێت ژیانی تەنیا بۆ لاشەیە و هەر لەم جیهانەدا و پاشەڕۆژی بونە بە گڵ و بێ زیندوبونەوەی تر.

ئەو ئادەمیزادە ئەوەی لەبیرچووەتەوە كە گیانێك بوو لە نهێنی (ملكوت)یدا و هاتە سەر شانۆی جیهان، بۆ ئەوەی بەشێك لەم چیرۆكە ببینێ و كاتی خۆی ئامادە بووە بۆ وەرگرتنی ئەم دەورە لە نێو ئەو و خوادا پەیمانێك هەیە و ئامادە بووە بۆ

پێشکەش کردنی (دراما)[٣٦]ی ژیان و پاش دابەزینی لەسەر شانۆکەو لاچوونی سەیرکەرەکان لێپرسینەوەی هەیە، سەرکەوتنی لەو دەورەیدا، یان بە تێکدانی و هەڵنەسانی بە هەڵسوڕاندنی دەورەکەی خۆی ئەمە بێهۆشی و نەزانین و لەبیر چوونەوەیە.

ئەو ڕوانین و دیدە تەسکەی کەوا دەزانێ دنیا هەموو شتێکە، دەبێتە هۆی گومڕایی فیکر و سەرسوڕمان لە بەردەم سزاو ئازارو خراپەدا.

ئا لێرەدا ناوی قورئان بەوە هاتووە کە یادخەرەوەو ئامۆژگاری و یادخستنەوەیە، تا خاوەن عەقڵەکان ئامۆژگاری لێوەرگرن، پێغەمبەریش ﷺ یادخەرەوەی ئامۆژگاریکارە {فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾} (الغاشية).

واتە: ئەم شتانە بخەرەوە یادیان و سەرنجیان ڕابکێشە، چونکە تۆ تەنها یادخەرەوەیت، هیچ دەسەڵاتێکت نییە بەسەریاندا.

دنیا هەموو چیرۆك و بەسەرهاتەکە نییە، بەڵکو بەشێکە لە چیرۆکەکە، بەرلە لەدایکبون سەرەتای هەبووەو دوای مردنیش بەردەوام دەبێت، لەناو ئەم دیدە گشتگیرەدا سزاو ئازار مانای

---

[٣٦] دراما شانۆگەرییە لە لاتینییەوە کراوە بە عەرەبی، هەندێکی مرۆڤ دەگریەنێ و هەندێکی پێی پێدەکەنێنێ، (المنجد في اللغة).

دەبێت، سزای دنیاش دەبێتە ڕەحمەتێك لە لایەن ئەو خوا میهرەبانەی کە بە هۆیەوە ئاگادارمان دەکاتەوە تا بێ ئاگا نەبین، ئەم سزایە هەوڵێکە بۆ ئاگاهێنانەوەی هەستەکان و پرسیارکردنی عەقڵ، هەروەها بیرخستنەوەیەکی بەردەوامە، کەوا دنیا هەرگیزاو هەرگیز بەهەشت نییە و نابێتە بەهەشت و تەنها قۆناغێکە، بە هەمیشە مانەوە لە چێژ و خۆشییەکانی دەبێتە مایەی بێ ئاگایی و لەناوبردنی خاوەنەکەی.

ئەم سزایە ڕوکەشەکەی سزا و ئازار و ناوەکیەکەشی میهر و بەزەییە، بەڵام سزای ڕۆژی دوایی ڕابونی بەسەر حەقیقەت و دادگەریی ڕەها، کە گەردیلەیەك لە چاکە و گەردیلەیەك لە خراپەی لەدەست دەرناچێ، هەروەها بریتییە لە یەقین بە یاسا و ڕێکوپێکی خوای بەدیهێنەری هەموو شتێك.

خوا بە هەموو کەسێك دەفەرموێت: { وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ } (الحجر: ٩٩). واتە: خوای خۆت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێدەگرێ.

لە کاتی مردن و لە پاش مردن ڕاستیی دەست پێدەکات.

## - خەڵوە چی پێوتم ؟

ئایا تۆ ڕاستگۆیت ؟

ئەمە پرسیارێکە لە هەر کەسێك بکرێت دەڵێ: (بەڵێ)، هەرکەسە وا دەزانێ ڕاستگۆیەو درۆ ناکات، جاربەجار یەکێکیان ددان دەنێ بە یەك دوو درۆدا کە کردویەتی، ئیتر وادەزانێ گەیشتۆتە ئەوپەڕی ڕاستیی و ڕاشکاوی لەگەڵ خۆی، ئەمە وا.

بەڵام دەستت بێنە بتگەڕێنم بە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم جیهانەی کە ئێمەی تێدا دەژین، تاکو بۆمان دەربکەوێت ڕاستی زۆر کەمە، بەڵکو هەر نییە، بەڕاستی ئەمە چاوڕاوە کە ئێمە وادەزانین (ڕاستگۆین).

با دەست بکەین بە درۆ ژماردن:

هەرکە بەیانی لە خەو هەڵئەسین پێش ئەوەی هیچ وتەیەك لە دەممان بکەوێتە خوارەوە، سەرمان شانە دەکەین و دەیخەین بە لایەکی سەردا، درۆیە. پیرو ئاخر شەڕەکان سەریان بۆیە دەکەن تاکو بە تەمەن لە خۆیان بچوکتر بێنە بەرچاو.

پیرە ژنەکان بۆیەی (ئۆکسجین) دەدەن لە پرچە سپییەکانیان بۆ ڕەشکردنیان تا بە تەمەن لە خۆیان بچوکتر بێنە بەرچاو، درۆ دەکات.

موچاخ (باروکە)ی سەری کەچەڵ، درۆیە.

تاقمی دەمی پیر، درۆیە.

سوخمەی سەر مەمکی ئافرەت، درۆیە.

ئارایشتی ئافرەت کە بۆ خەڵەتاندنی سەیرکەرانی دەیکات، درۆیە.

بۆدرە، سوراو، سپیاو، کلی چاو، برژانگی دەستکرد، ڕەش کردنی برۆ،..... هتد هەمویان درۆن.

ئەو قردێلەی قژی کچانی پێدەبەسترێ، قژی کچێکی تەمەن سی ساڵە بیبەستێ درۆکردنە.

خۆیان هاوار لە درۆزنی خاوەنەکەیان دەکەن.

ئەمە پێش ئەوەی کەس وتەیەکی لەدەم بێتە دەرەوەو دەنگ بکات.

بەڵام خۆ ئەگەر دەمی کردەوەو وتی: بەیانیت باش، ئەوە هەر زمانی فێر بووە باشی داوا دەکات، ئەگینا کەی لە دڵەوە باشی داوا دەکات؟!

زۆر هەیە قینی لێیەتی کەچی داوای باشی بۆ دەکات، درۆیە.

ئەو کچەی لەگەڵتایەو دەڕۆن بۆ سینەما و بارِ و باسی هێرشی خۆشەویستی خۆیت بۆ دەکات، بیری هەر لای جزدانی پارەکەتەو بزانێت بەشی چەند قاپ ویسکی دەکات، درۆیە.

جاڕ (اعلان)ی چاکی فلانە جگەرەو باشی بۆ تەندروستی، درۆت لەگەڵدا دەکات.

ئەو جاڕەی دەڵێ: (حەبی ئەسپرین) ڕزگارت دەکات لە نەخۆشی (ئەنفلۆنزا)، درۆیە.

جاریٚ باسی مامەڵەو کڕین و فرۆشتن مەکە، هەموی درۆیە.

وێنەی یاریکەری تێنس کە قاپیٚ ویسکی بە دەستەوەیە، یان وێنەی ئەو پیاوە ماسولکە گەورەیەی لەسەر قوتوی میوەوە دروستکراوە..... هتد هەمووی درۆیە.

یان ئەو درۆ ڕەنگاو ڕەنگانە سەیر بکە، کە داکوتراون بە سەر دیوارەکانەوەو پڕوپاگەندە بۆ سینەما و تەلەفزیۆن دەکەن.

بەس دەست لە ڕۆژنامەو گۆڤار مەدەن، چونکە بە هەزاران درۆیان لیٚ هەڵدەوەریٚت، درۆ بووە بە خویەکی بازرگانی.

لە جیهانی ڕامیاری و لە ناو ڕامیارەکانداو لەناو نەتەوە یەککرتووەکاندا و بە دەم باڵویٚزەکانەوە (سفیر) درۆ بناغەی کارەکەیانە.

دیبلۆماسی بەرز ئەوەیە کە چۆن بتوانیٚت وا لە درۆ بکات، کە خەڵکی بە ڕاستی بزانیٚت و چۆن دەم و دڵی وەك یەك نەبیٚت و چۆن چاوبەست لە خەڵکی بکات.

جارێك چەرچل[٣٧] گۆڕێکی بینی کە لێی نوسرابو: (ئەمەیە گۆڕی پیاوی ڕاستگۆو ڕامیاری بەرز). بە پێکەنینەوە گوتی: ئەمە یەکەم جارمە لە ژیانمدا ببینم دوو پیاو لە یەك گۆڕدا نێژراین.

باوەڕی بەوە نەدەکرد کە پیاوی ڕاستگۆو ڕامیاری یەك پیاو بێت، چونکە چەرچل وای زانیوە کە بناغەی ڕامیاری درۆیە.

گرنگترین مەرجەکانی ڕامیاری ئەوەیە کە ڕاستی بشارێتەوە بۆ بەرژەوەندی، دڵ نەرمی لابەرێت تاکو فرۆفێڵ و زیرەکی و تێکەیشتویی بە پێش بخرێ.

هەتا لە ئایین و جیهانی پەرستنیشدا خەڵکی ناڕاستی ئەم دەمی ئێمە درۆیان تێکەڵکردوەو کردویانە بە خوو.

بۆ نموونە، مانگی ڕەمەزان، مانگی دەمگرتنەوەیە لە خواردن. کەچی بە پێچەوانەوە دەبێت بە مانگی خواردن، پاقلاوە و بورمە و لوقمەقازی سەردەردێنن و هەموو ماڵێك بە پێی خۆی ترشیات و زیاتر لە جارانی برنج و ماست و پەنیر ئامادە دەکات، خواردنی گۆشت لە ڕەمەزاندا دەبێ بە دووقاتی مانگەکانی تر،

---

[٣٧] چەرچل: لە ساڵی ١٨٧٤ لە ئینگلتەرە لە دایکبوەو لە پیاوە رامیارەکانی ئینگلیزە. گەورەترین شوێنەواری رامیاری ئینگلیزی وەرگرتووە و سەرۆکی پارتی (محافظین) بووە، لەگەڵ کەسێکی تردا بوون بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم.

بەم جۆرە مانگی ڕەمەزان دەبێت بە مانگی سینی و مریشك خواردن.

لە نێوان هەموو سەد نوێژكەرێكدا زیاتر لە نەوەدونۆیان كە لە بەردەمی خوادا وەستاون بیریان لای نوێژەكە نییەو بیریان بەلای بەرژەوەندی دنیایی خۆیانەوەیە، گوایە خواش دەپەرستن، لە ڕاستییدا بەرژەوەندی و مەبەستی خۆیان دەپەرستن، دێنە ڕوكوع بردن بۆ ئەوەی ئەم بەرژەوەندیی و مەبەستەیان بۆ بێتە دی.

پاپاكانی سەدەكانی ناوەڕاست سكرتێری پاشاو سەرۆكەكان بون و تەزبیحەكانیان ئاڵتون و زیوو بوو، پێخەفیان ئاوریشم بوو، خاوەنی ئەوپەڕی دارایی و سامان بون، هەریەكەیان دەرەبەگێك بون بۆ خۆیان بەناوی ئەو ئینجیلەوە كە دەڵێت: (دەوڵەمەند ناچێتە مەلەكوتی خوا هەتا وشتر لە كونی دەرزییەوە هاتوچۆ نەكات).

' بەڵكو پاپاكان وایاندەزانی بەهەشت بە دەست ئەوانە و دەستیانكرد بە فرۆشتنی و پسوولەی لێخۆشبون (صكوك الغفران)یان دەفرۆشت بە كڕیارەكانی.

دڵداری و خۆشەویستی هەمووی فێڵە، سەیر دەكەیت دوو دڵخواز وتوێژ دەكەن و فڕوفێڵ لە یەكتری دەكەن، بۆ ئەوەی

بەڵگەیەکی جوان بدۆزنەوە بۆ بڕینی ڕێگەکە، هەتا چونە سەر نوێن.

لەو وڵاتانەی کە بە پێشکەوتوو ناودەبرێن، خۆشەویستی وەك یارییەك وایە بۆ بەسەربردنی کاتی بیٚ کاری، یان ئازایی خۆی تێدا نیشان دەدات، یان بە هۆی سەرکەوتنی فەرمانێکی دادەنێت.

هەندیٚ جار وشەی خۆشەویستی درۆیەکی شیرینکراوەو مەبەستێکی خراپی وەك دەست بەسەراگرتنی بەدواوەیە.

هەندیٚ جاریش وشەی خۆشەویستی درۆیەکە ئاشکرا دەبێت، وەکو ئەوەی خۆشەویستی ئەویٚ بۆ میرات، یان بۆ بەدی هێنانی پلەیەك هەر زۆری بۆ ئەوەیە خۆشی و تام بچێژیٚ و دڵی نەختێك بخورێنیٚ و بۆ زاڵبون بەسەر شەرمنی.

جا بۆ بێتاوانی خۆیو ڕازیکردنی دڵی خۆی، ئافرەت دوا پارچەی جلەکانی بەری دادەکەنیٚ بۆ خۆشەویستەکەی و دایدەنێت ئەمەی کە کردویەتی قوربانی خۆشەویستییە و خۆشەویستییەکی پاکی بەجیٚ هێناوە، چی بکات فەرمانی خوایەو قەزاو قەدەرە و ناگەڕێتەوە، کەچی ئەمە نە یەکەم خۆشەویستی بووەو نە دوا خۆشەویستی دەبێت.

هیچ شتێك نییە بە قەدەر خۆشەویستی و دڵداری درۆی تێدا هەبێت، هەموو وشەیەکی درۆیە، هەموو دەست لێدانێکی درۆیە، هێرشی ئارەزوو (هیجان الجنسی) خۆی درۆیە، چەند زوو هەڵدەگیرسێ و چەند زوو دادەمرکێت و تامی نامێنێ!

بونی ڕاستی لە خۆشەویستییدا دەگمەنە، دەگمەنتر لەوەی کە گەوهەر لە بیاباندا هەبێ.

هەر لە گۆرانی خۆشەویستی و چیرۆکەکانی و باسکردنی ناخۆشی دڵداری و هەڵبەستەکانی و ئاخی نیوەشەو و بەرەبەیان و فرمێسکی سەرسەرین، هەموویان تابلۆی درۆن و بە دەستی هونەرمەندە درۆزنەکانی ڕێگای دڵداری دروستکراون.

درۆ لەو هەڵبەستانەدا زۆرە کە بوێژەکان هاتوون بە شان و بازوی پیاوە گەورەکاندا دەڵێن.

هونەریش زادەی ئارەزو و سروشتن. سروشتیش دەگۆڕێ.

ئەمجا بۆت دەرکەوت درۆ چەند زۆرە، ئیتر کوا ڕاستی؟؟!!!

تەنانەت لە خواردنیشدا درۆ دەکەین، ئێمە تێرین و دەشخۆین.

ئیتر کەی ئەو ڕۆژە دێت ڕاستیمان دەست بکەوێت.

ئەگەر بە میکرۆسکۆب بگەڕێین ڕاستیمان دەست ناکەوێت.

تەنیا هۆش (عقل) ڕاستە، بێ لایەنە لە هەموو شتێکدا.

زانست ڕاستە، بە مەرجێك کە ئارەزووی خاوەن هۆش و زانستەکە (خەڵوە)یەك لەگەڵ هۆش و زانیارییدا بکات و بیر لە هەموو شتێك بکاتەوە و بە نهێنی کۆبونەوەیەك لەگەڵیاندا بکات بۆ دۆزینەوەی ڕاستی و ڕێگای ڕاست.

وتوێژێك لەگەڵ عەقڵ و زانستدا (سێ بە سێ) بکات لە ناو دڵی خۆیدا بێ ئەوەی کەس گوێیان لێیان بێت.

بە دان پیانانی چاکەو خراپە و بە شیتەڵکردنەوە، هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە، بەڵام بێ لایەنیی گرتنی و مەبەستی دەرکەوتنی ڕاستی بێت، لەم کاتەدا هەست بە جیهان و درۆکانی جیهان ناکات، چونکە ئەو کەسە لەبەردەستی هەق و ڕاستی بەڕێزدایە، ئیتر چ ڕایەکیان دەکەوێتە درۆو تەڵەکەو فێڵ، ڕوو بکەنە ئەو شوێنە.

بەڵام ئەگەر ئەم هەلە لە کیس ئادەمیزاد دەرچوو ئەم کۆبونەوەیەی نەکرد ئەوە هەموو تەمەنی بە خۆڕایی ڕۆیشتووەو تەمەنێکی بێ کەڵکی بەسەربردووە، ئەو تەمەنە جوانەی کردووە بەژێر هەرەسی درۆوە، ئاگاداربونەوەی پاش لە دەست دەرچوونی هەل بێ کەڵکە.

لەبەر ئەمەیە کە خەڵوە شتێکی پێویستەو بەڕێزە بۆ ئادەمیزادی ئەم چەرخە ون بووەی ناو درۆو فیشاڵ.

ئادەمیزاد بە تەنیا لە دایك دەبێ و بە تەنیا دەمرێ و بە تەنیاش دەڕواتە بەردەست ڕاستی و دادەوە.

زێدەڕۆیی نییە بڵێین جیهانمان پڕە لە درۆ.

یەكتر دەكوژین بۆ هێنانەدی ئارەزووەكانمان و لە ڕێی بەسەربردنی فێزو دەمارو خۆهەڵكێشانماندا، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەوەشدا كە لە ناو ئەم جیهانەدا دەژین، هەر حەزمان لە ڕاستییەو لەسەر ڕاستی خۆمان دەدەین بە كوشت و شانازی دەكەین بەمردنەوە، دڵمان پڕە لە هەستی خۆشەویستی ڕاستی، با نەشیگەینێ.

هەر ئەم هەستە بەڵگەیە بۆ بونی ڕاستی.

ئەگەر ئێمە حەقیش نەبین و نەشی گەینێ، لەناوماندایەو هاندەرمانە، حەق نموونەیەكی ڕەهایە. هیچ ساتێك لە ویژدانماندا ون نابێ، چاومان هەردەم بەرامبەری كراوەیە.

زانست ئەم ڕاستیەمان نیشان دەدات.

چاودێری كردنی خود (مراقبە النفس) ئەم ڕاستییەمان نیشان دەدات.

چاو نیشانمان دەدات.

ڕاستی لە قورئاندا (الله)یە.

هەموو پارچەكانی ئێمە بەڵگەیە بۆ بونی ئەو.

بە دەسەڵات ترە لە هەموو جیهان.

دەبینین بە چاوی دڵ نەك بە چاوی سەر.

گیانمان بەڵگەیە، هەر لە بوونییەوە تاکو ڕۆژی داکەندنی بەرگی لەش.

بەڵام ئەوەی کە سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە هەندێك داوای بەڵگە دەکەن بۆ بونی خوا، بۆ بونی ڕاستی، کەچی ناو دڵیشیان پڕە لە خۆشەویستی خوا- ڕاستی.

کەسێك ڕوگەی هەموو دڵەکان و ئامانجی هەموو بەرچاو ڕونەکان بێت، چۆن گومانی لێ دەکرێ؟ چۆن گومان لە بونی دەکەین ؟ لە کاتێکدا دەستی بەسەر هەموو هەستەکانماندا گرتووە؟

چۆن گومانمان لە حەق بێت و بەڵگەی پوچی لەسەر بێنینەوە؟

چۆن لەگەڵ ژیربێژی فێڵبازدا بە پلەیەکی هاودژیی وا هەڵخلیسکێین، کەوا کاکڵەو کرۆکی بون و ڕاستیان بخەینە شوێنی پرسیارەوە؟

من لەو ئامۆژگارییە بە نرخترو گرنگتر نادۆزمەوە کەوا دەڵێم:

با هەریەکێك لە ئێمە بگەڕێتەوە بۆ فیترەتی خۆی.

با بگەڕێینەوە بۆ ئەو پاکی و بێگەردییەی کە پێچ و پەنای ژێربێژیی و عەقڵی فێڵباز پیسی نەکردووە.

ئەم فیترەتە گۆڕان و شێوانی قبوڵ نییە، چونکە تەوەرو کاکڵەی خولگەی بونە و هەموو زانست و زانینەکانی لەسەر بنیات دەنرێ.

خوای گەورەش دەفەرموێ: { فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ } (الروم: ٣٠).

واتە: تۆ ڕوو لەم دینە بکە و هەر بەرەو هەق هەنگاو بنێ، دینێکی بنەڕەتەو لە بنەڕەتدا خوا ئەو خەڵکەی هەر بۆ یەکتاپەرستی وەدی هێناوە، کاری خوداش گۆڕانی بەسەردا نایەت.

خوای گەورە ئەم فیترەتەی وا دروستکردووە کە مەیلی بەلای خۆیدا بێت، بە سروشتی خۆیەوە هەردەم داوای لای خوا دەکات، هەروەك چۆن جەمسەری قیبلەنما ئاماژەو ڕوو لە ئاڕاستەی قیبلە دەکات.

با هەر یەکێك لە ئێمە وەك سروشتی خۆی وابێ زیاتر نا.

دەبینی سروشتەکەی حەقی پێ نیشان دەدات.

بەبێ کۆشش فیترەتەکەی بۆ لای خوای شارەزا دەکات.

هەروەك خۆت بە.

خودی خۆت لە ڕێی ڕاستت شارەزا دەکات.

کاتێ کاتژمێرێك تەنیاین، با بگەڕێینەوە لای دڵمان، هەر یەکێك لە ئێمە با لە دڵی بپرسێ.

دڵیشی هەموو شتێکی پێ نیشان دەدات.

چونکە خوا ئەو قیبلەنمایەی داناوە لە دڵماندا کە هەر روو دەکاتە خۆی، کە ناوی فیترەت و بەڵگە نەویستییە.

## ـ هاوسەنگی گەورە :

ئەو شەوەم لە یاد ناچێت کە پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر لە گەڕانەوەکەمدا بۆ (ئەدگال) لە (ئەفریقای ئیستیوائی)[٣٨] بە (نیل)[٣٩]ی پاندا بە کەشتییەکی سەرگیراو دەڕۆیشتین تاکو لە (سەلگال)[٤٠] ڕەت بوین و گەیشتینە شوێنێك کە مێشولەی زۆری هەبوو.

(نیل)یش لەو شوێنەدا پان بوو بوو وەك بواری لێهاتبوو، چاو ئەوبەری نەدەدی، یەکسەر ئەوانەی لەناو کەشتییەکەدا بون بە کەشتییەوانەکەشەوە نەخۆش کەوتن لەبەر زۆری گەستنی مێشوولە.

بەڵام من حەبی (کامۆکین)م بە شێوەیەکی ڕێکوپێك قووت دەدا، تاکو تووشی لەرزو تا نەبم.

شەو ویستم بڕۆمە سەر کەشتییەکە تاکو بە شەو سەیرێکی سودان بکەم، دەمو چاوم و دەستم چەور کرد بە ڕۆنی دژی مێشووله و کاتێ چوومە سەرەوە شتێکی زۆر سەیرم دی.

---

٣٨ ئەفریقای ئیستیوائی: بریتییە لە گابۆن و کۆنگۆ و چاد و .... هتد، لە ساڵی ١٩٠٨دا کەوتە ژێر دەستی فەرەنسییەوە و بە ئەفریقای فەرەنسی دەناسرێت.

٣٩ نیل: روبارێکی گەورەیە و درێژییەکەی (١٥٠٠) کم دەبێت و لە دەریاچەی (ڤیکتۆریا)وە هەڵدەقوڵێت و ژیانی میسر بە سەر ئەم روبارەوەیە.

٤٠ سەلگال: شارێکە لە سودان و دەکەوێتە سەر رووباری نیل.

سەیرم دەکرد بە هەزاران پەلی درەخت دادەگیرسێ و دەکوژێتەوە، دەتگوت جەژنەو بە هەزاران گڵۆپی کارەباییان پێدا کراوە، دەکوژێنەوەو دادەگیرسێن، دەستم هێنا بەسەر چاومدا نەوەکو ڕێچکەو پێچکە بکات، دیسان سەیرم دەکرد ئەوەی دیبوم تەواو ڕاست بوو، دەتگوت ئەو دارانە یەکپارچە بە گڵۆپ داپۆشراون.

هەرکە دابەزیم و پرسیارم لە کەشتییەوانەکە کرد، وتی: ئەمانە گیانەوەری گوڵەئەستێرە (حباحب)[٤١]ن، هەرکە دەگرێت بەو گڕە مێشوولە ڕادەکێشێت بۆ لای خۆی و دەیانگرێت و دەیانخوات، لەوەختی خواردنی مێشوولەکاندا گڕەکەی دەکوژێتەوە تاکو جارێکی تر دایگرسێنێ بۆ ڕاوە مێشوولە.

ئەمە دەستووری خوایە، هەرکاتێك شتێك لە ڕێژەی خۆی زیاتر بوو و دژێکی بۆ دروست دەکات، تاکو بە هاوسەنگی لە نێو هەموو دروستکراوەکانیدا بمێنێ و هیچیان هیچیان دانەپۆشێت.

هەر بیرم لەو شەوە دەکردەوە.

هەر بیرم لە وتەی کەشتییەوانەکە دەکردەوە.

---

[٤١] گوڵەئەستێرە: کرمێکی ڕەنگاو ڕەنگە بەشەو دەگەڕێن و لە کلکیاندا گڕێك هەیە وەکو ئاگر بە عەرەبی پێی دەڵێن (حباحب).

هەموو ڕۆژێك بەڵگەم بۆ زیاتر دەبوو، پێی دەسەلماندم کە ئەم گەردونە شانۆی هاوسەنگییەکی گەورەیە لە هەموو شتێکدا و هەموو بە ئەندازەی زۆر ورد دروست کراون.

ئەگەر زەوی بچووکتر لەو قەوارەیە دروستبکرایە، کێش (جاذبیة)کەی کەمتر دەبوو، هەوای تێدا نەدەماو ئاوەکەی هەموو دەبوو بە هەڵم و چۆڵ دەبوو، وەکو مانگ، نە ئاو، نە هەوا، نە ژیان دەبوو.

ئەگەر قەوارەکەی گەورەتر بوایە هێزی کێش (جاذبیة)ی زیاتر دەبوو، جموجوڵی تێدا زۆر گران دەبوو، کێشی هەر یەکێك لە ئێمە چەندان زیاتر دەبوو، نەماندەتوانی هاتوچۆ بکەین.

ئەگەر سوڕانی بە دەوری خۆیدا زیاتر بوایە وەکو مانگ ڕۆژێکی دەبوو بە (١٤) ڕۆژو شەوێکی دەبوو بە (١٤) شەو و ئاوو هەوای دوو هەفتە زۆر گەرم و گران دەبوو، دوو هەفتەی تر سەرمایەکی بکوژ دەبوو، ژیان تێیدا مەحاڵ دەبوو.

یان ئەگەر زەوی نزیکتر بوایە لە هەتاو زیاتر لە ئێستای وەکو ئەستێرەی (زوهرە)، گەرما دەیسوتاندین، ئەگەر دورتر بوایە وەکو (زوحەل و مشتەری) سەرما دەیکوشتین.

لەمانەش گرنگتر ئەوەیە دیارە زەوی بە گۆشەیەکی لار دەسوڕێتەوە کە دەکاتە (٢٣) پلەو بەم لارییە کژەکان و

بەکارهێنانی ناوچەکان بۆ کشتوکاڵی لێ دروست دەبێت و دەسازێ.

ئەگەر توێکڵی زەوی لەمە ئەستورتر بوایە، هەموو هەوای ئۆکسجینی هەڵدەمژی و بەشی خواردنی ئێمەی لەم گازە بەکەڵکە نەدەهێشتەوە.

ئەگەر دەریاکان قووڵتر بونایە هەموو گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیان هەڵدەمژی و بەشی ڕووەکیان نەدەهێشتەوە.

ئەگەر پەردەی هەوایی تەنکتر بوایە، تیشکی هەتاو دەیسوتاندین.

یان ئەگەر هەوای ئۆکسجین زیاتر بوایە لەوەی ئێستای، یان هەموو شتێك دەسوتا یان گڕێکی بچووکی ئێستا دەبوو بە تەقینەوەیەکی گەورە، ئەگەر کەمتر بوایە، یان هەر نەدەژیایین، یان زۆر سست دەبوین.

ئەگەر بەفر لە ئاو سووکتر نەبوایە، نەدەکەوتە سەری و ژێر دەریاو زەریاکان بە گەرمی نەدەمایەوەو بۆ ژیانی ماسی و نەهەنگەکان.

ئەگەر چەتری ئۆزۆن نەبوایە لەسەرو هەوای سەرزەمین (کە ناهێڵێ تیشکی وەنەوشەییمان بگاتێ، بێجگە لە ڕێژەیەکی زۆر کەم) ئەو تیشکە ژەهراوییە دەیکوشتین.

ئەگەر نەختێك بە وردی سەیری لاشەی ئادەمیزاد بکەین، ئەو کاتە مەتەڵی زۆر سەرسوڕهێنەرمان بۆ دەردەکەوێت، هەموو شتێك ڕێژەی تایبەتی خۆی هەیە، خوێن، سۆدیۆم، پۆتاسیۆم، کالیسیۆم، شەکر، کۆلسترۆڵ،... هتد.

بەتێکچوونی ئەم ڕێژەیە (با زۆر کەمیش تێك بچێت) ئەوە خاوەن لاشەکە نەخۆشە، خۆ ئەگەر پەرەی سەند ئەوە مانای مردنێتی.

لاشە، چەکدار کراوە بە چەند ئامێرێکی خۆکار (آلي) کە خۆی لە خۆیەوە ئیش دەکات بۆ هێشتنەوەی ئەو ڕێژەیە بە درێژایی ژیانی ئادەمیزادەکە.

ڕێژەیەك هەیە بۆ زیادو کەمی خوێن کە بیپارێزێت.

ڕێژەیەك هەیە بۆ زیادو کەمی ترشەڵۆکی میز، کە بیپارێزێت.

هەروەها هەموو ئەوانی تر.

پلەی گەرما هەموو کاتێك لە (٣٧) پلەی سەدەی دەوەستێت و کردەوەیەکی فسیۆلۆجی و کیمیاوی هەیە و ناهێڵێ زیادو کەم بکات.

هەر بەو جۆرە ژێیەکانی ماسولکە، لێدانی دڵ، یاسای چۆنیەتی مژین و فڕێدانەوە، ڕژێمی سوتاندنی کیمیاوی لە تەنوری جگەردا، هێزی توڕەیی و لەسەرخۆیی، هێزی

ڕێکوپێکی ئیشی هۆرمۆنەکان لە تیژی و سستی بەپێی کردەوە کیمیاوییەکانیان و بژێوییان.

بەڕاستی مەتەڵێکی سەرسوڕهێنەرو هونەرییە، ئەم هاوسەنگییە، کە هەموو پزیشکێك و توێژەرێکی فسیۆلۆجیا و توێکاری و کیمیا، ئەمە دەزانێ.

{وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا} (الفرقان: ٢)

واتە: هەموو شتێك بە ڕادەی خۆی دروستکردو ئەندازەی گرت.

لەم بارەیەوە نموونە دوایی نایەت لە زانستەکانی (ڕووەکی، گیانەوەری، پزیشکی و گەردونگەری) و هەزاران کتێبی دەوێت.

هەموو لاپەڕەیەکی لایەنگیرو دوپاتی دەکاتەوە، کە ئەم هاوسەنگییە پتەو و ڕێکوپێکییە گەورەیە لە دروست بوەکاندا هەیە.

بەڵام واز لەو سەرلێشێواوانە بهێنە کە دەڵێن ئەم بونەوەرە بە ڕێکەوت (صدفة) دروستبوە، ئەمە ئەوپەڕی بێ هۆشی و بێ عەقڵی و نەزانینە، وەکو بڵێن نارنجۆکێکمان (رُمانة) فڕێدایە ناو چاپخانەیەك و کەچی بە ڕێکەوت بو بە فەرهەنگێکی ڕێك و پێك.

ئەو زانا کیمیاوییە سەرکەشەی وتی: (هەواو ئاو و گڵم بۆ بهێنن لە زروفێکدا مرۆڤێکتان بۆ دروست دەکەم).

ئەم کیمیاوییە دانرا بە کەم دەست و دەستکورت لەو شتانەدا لەو زروفەیدا، ئەوپەڕی بێدەسەڵاتییە کە بیەوێت لاسایی دروستکەر (خالق) بکاتەوە.

گەر ئەم هەموو ڕەگەزو ڕەوشانەی بۆ ساز بکەین، بە گریمانە وا دانێین توانی مرۆڤێك دروست بكات، ئەوكات ناڵێت بە ڕێکەوت دروستبوە، بەڵکو دەڵێت من ئەو ئادەمیزادەم دروستکردوە.

ئەو مەیمونەی کە لەسەر پیتنووسێك (طابعة) دادەنیشێ و هەر چەپۆڵە دەدات بەسەر پیتەکاندا و پیت دەردەچێت. با ڕۆژێك هەڵبەستێك لە هەڵبەستەکانی (شکسپیر)[٤٢] بەڕێکەوت چاپ بکات، یان نامەیەك بە ڕێکەوت بنوسێت.

قەیدی نییە دەڵێین بە ڕێکەوت لە زەلکاوەکاندا ترشەلۆکی نەوەوی (DNA) پەیدا بوو کە خۆی دەتوانێ خۆی دروست بکاتەوە.

بەڵام ئەم ترشەلۆکە چۆن توانی ببێ بەم ژیانە گەورەیەی ئێستا دەیبینین؟

---

[٤٢] شکسپیر: بویژێکی ئینگلیزیەو خاوەنی چەند شانۆگەرییەکی بەرزە لە ساڵی ١٥٦٤ لە دایك بووە و ساڵی ١٦١٦ دا مردووە، لە ئەدیبە بەرزەکانی جیهان دەژمێردرێت.

ئایا دەبێت بڵێین بەڕێكەوت پرۆتۆپلازم پەیدا بوو؟!! بەڕێكەوت خانە (خلیة) پەیدا بوو؟!! ئەمجا بەڕێكەوتی سێهەم بوو بە دوو چەشن؟

خانەی ڕووەكی و خانەی گیانەوەری.

ئەمجا هەموو لقەكانی تری ژیان، هەر بەڕێكەوت بون.

ئەمە بوو بە ئەفسانە (سحر).

توخوا ئێمەش بڵێین ڕێكەوتە، ژیری (عقل) گاڵتەمان پێ ناكات؟

بەڕێكەوت پەلەوەرو ماسیە كۆچەرەكان بە هەزاران كیلۆمەتر ڕێگا دەبڕن بەسەر شاخ و داخ و دۆڵ و چۆڵ و بیاباندا و بەناو دەریاو زەریاكاندا؟!

بەڕێكەوت (بێ پێوتن) جوجكە لە ناسكترین شوێنی توێكڵی هێلكەكەدا دوای شكاندنی بە دەنوك دەردێت؟

بەڕێكەوت برین سارێژ دەبێت و بۆ خۆی بەبێ نوشداری دەیدورێتەوە.

بەڕێكەوت گوڵەبەڕۆژە دەزانێ كە هەتاو چاوگەی ژیانیەتی و ڕوی تێ دەكات (یان بە شریت پێیەوە بەستراوە)؟

بەڕێكەوت داری سەحراوی باڵ بۆ تۆوەكانی دروست دەكات بۆ ئەوەی بفڕین و لە شوێنی ئاوداردا بڕوێن؟

بەڕێكەوت ڕووەك (ماددەی كلۆرۆفیل)ی دۆزیەوە، تاكو وزەی پێ دروست بكات؟

بەڕێكەوت مێشوولە بۆ گەراكانی كیسەی هەوایی دروست دەكات؟ (یان مامۆستا ئەرخەمیدیس پێی وتووە)؟

ئەی هەنگ، كە ژیانی پڕە لە هەموو شێوەیەكی كۆمەلایەتی و هونەرمەندی و ئەندازیاری و كیمیاوی بۆ دروستكردنی هەنگوین و مۆم لە شیلەی گولان؟

ئەی پەلەوەرە ڕەنگاو ڕەنگەكان لە كام دەرمانخانەی ئێمە دەرمانیان كڕی بۆ ئارایشی خۆیان؟ ئەمانە بەڕێكەوتن؟؟!!!

ئەگەر بڕوامان هێنا بە یەك ڕێكەوت، ئەی ئەم هەموو ڕێكەوتە چی لێ بكەین؟

چۆن ژیری پێمان پێناكەنێت و گالتەمان پێناكات؟

ئەمە پڕو پالانتەیەو ڕێناكەوێت، مەگەر لە فیلمێكی قۆشمە (هزلی)دا نەبێت.

فیكری ماددی خۆی لەناو تەنگەبەری ئەم نەزانینەدا دۆزیوەتەوە، دەیەوێت خۆی لە وشەی (ڕێكەوت) ڕزگار بكات، ئینجا وشەی (پێویستی) داهێناوە، وەكو پێویستی پالت پێوەدەنێت بۆ نانخواردن كاتی برسیەتی، ئیتر هەر پێویستییەو پالی نا بە پێویستییەوە تاكو ئەم ژیانەی دروستكرد!

ئەمە تاقیكردنەوەی دەنگی زوڕنایە و یاری كردنە بە وتە.

هیچ جیاوازی نییە، لە جیاتی وشەی ڕێكەوت وشەی (پاڵەپەستۆی پێویستیان) دروستكردووە.

چۆن ڕووداوێك لە خۆیەوە بە پێویست بەبێ هۆش و بیری نوسەرێك دەبێ بە چیرۆك و دەچێتە سەر لاپەڕە؟ بەڵام ئەی كێ ئەم پێویستییەی دروستكرد؟

چۆن پێویست بەبێ پێویستی دەبێ؟

ئەمە مراندنی ئەو هۆشە بۆگەنەیە كە خۆی دەپارێزێت لە دەنگی چۆنیەتی دروستبونی خۆی، هەر بۆ ئەوەی نەڵی خوایەك هەیەو ئەم هەموەی دروستكردوەو هەر ئەو (مایسترۆ)ی لێدانی ئەم بەستە جوانەیە.

ئەم هاوسەنگییە گەورەیە و ئەم گونجان و پێكەوەبەستنەی كە لە ملیۆنەها شتی وردو درشت پێكدێت، هاوار دەكات و بەڵگەیە بۆ ئەو دروستكەرە بە دەستەڵاتەو نزیكترە لە دروستكراوەكانی لە لاشەو خوێنی خۆیان، دەیانپارێزێت باشتر لە باوك و هەموو داخوازییەكانیان جێبەجێ دەكات، گوێی لە هەموو هەناسە ساردەكانیانە، چاوی بە هەموو كردەوەكانیانەوەیە، ئەمە ئەو خوایەیە كە قورئان ناوی ناوە (الله)، هەر ئەو خوایە، نەك ماددەی كەڕو بێ دەنگ، نەك خوای

(ئەرستۆو ئەفلاتون)، نەك بونی ماددی، وەكو (سپینزا)و شوێنكەوتووەكانی باوەڕی (وحدة الوجود) وا دەزانن!

ئەو خوایەی تاك و تەنیایەو هیچ كەس لە وێنەی نییە، بەرزترە لەوەی ئێمە دەیزانین وەكو چۆنیەتی و وێنەو....

بە كردەوەكانیەوە دیارەو خۆی شاراوەیە.

چاوەكان ناتوانن بیبینن، ئەو هەموو شت دەبینێ.

هەموو چاوەكان بە هۆی ڕوناكی ئەوەوە دەبینن.

بەڵام هۆشی زانیارییەكانی ئێستای ئێمە بڕوا بەم وشە (سۆفیانە) ناكەن، چونكە دەڵێن ئێمە بڕوامان بە نادیار (غیب) نییەو زانین لە هەست پێكراوەوە دەست پێ دەكات و دوایی دێت.

ئێمەیش پێیان دەڵێن: ڕاست ناكەن، چونكە:

نیوەی زانستی ئێستا، بەڵكو هەمووی نادیارو غەیبە.

زانست سەیر دەكات و دەنوسێت، سەیر دەكات سەركەوتن بۆ چیاكان گرانترە لە هاتنەخوارەوەیان، یان سێوێك كە پچڕا لە دارەكەی دەكەوێتە سەر زەوی، مانگ بە ئاسمانەوە وەستاوەو ناكەوێت.

ئەمانە هیچ پەیوەندییان نییە بەو ئیشانەی كە بەسەریاندا دێت، ئەی چییە؟ كەواتە نادیارە!

بەڵام نیوتن[٤٣]، دەڵێ: ئەمانە هەموو کێشەر (جاذبیة) ئەم کارانە دەکات. ئەمە بیردۆزەیەکە و شیتەڵی هێزی ئەم ڕاستییەی بۆ کردوین.

بەڵام کێ هێزی ئەم (جاذبیة) دەبینێ؟ خۆ کەسیش کۆڵەکەکانی ئاسمانی نەدیوە کە ئەستێرەکانی پێوە بەسترا بێت!

نیوتن کە خاوەنی بیردۆزەکەیە بە (بنتلی) هاوڕێی دەڵێت: ئەمە کارێکی نادیارە کە دەبینی ماددەیەکی مردوی بێ گیان هێز دەخاتە سەر ماددەیەکی تر و ڕای دەکێشێت بەبێ ئەوەی پەیوەندییەك هەبێت لە نێوانیاندا.

سەیرێکی ئەم بیردۆزە زانستیانە بکە چۆن هەموو کردەوەکانیان نادیارن و باوەڕمان پێیان هەیە، کەچی نادیارن (غەیب)ن.

ئەلیکترۆن، شەپۆلەکانی بێ تەل، گەردیلە (ذرة)، نیوترۆن، کردەوەی ئەمانە بە چاو نابینرێن، کەچی باوەڕمان پێیان هەیەو بە دەرس دەیانخوێنین و کارگەو تاقیگەیان بۆ دروست دەکەین، لەگەڵ ئەوەشدا نادیارن و هەستی ئێمە بێ ئاگایە لێیان.

---

[٤٣] نیوتن: فەیلەسوفو زانای ئینگلیزییەو (١٦٤٢. ١٧٢٧) ژیاوە. زانای ماتماتیك و فیزیا و گەردونگەرییەو خاوەنی یاسای کێشەری گشتییە (الجاذبیة العامة) یەو یاسای زۆری هەیە لە زانیاری گەردونگەری (علم الفلك)دا.

زانست هەرگیز ناوەڕۆکی هیچ شتێکی بۆ دەرنەکەوتووە، ئێمە هیچ نازانین بێجگە لە چەند ناوێك، ئێمە چەند زاراوەیەك ئاڵوگۆڕ دەکەین، بێ ئەوەی ناوەڕۆکی بزانین.

هەر بەم جۆرە خواش کاتی خۆی بەس ناوی فریشتەکانی فێری ئادەم کرد، ناوەڕۆکەکەی فێر نەکرا[44].

{ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا } (البقرة: ٣١) .

واتە: هەموو ناوەکان فێری ئادەم کرا.

ئەمە سنوری زانستە، ئامانجی زانست ئەوەیە کە پەیوەندی و چۆنیەتی و چەندایەتی ماددەکان بزانێت، بەڵام ناتوانێت جەوهەرو ماهیەتیان بزانێت، چۆنیەتی شت لە دەرەوەی دەزانێت، ئیتر نازانێت ناوەڕۆکەکەی چییە. لەگەڵ ئەمەشدا هەر لە خۆیەوە بیردۆزەیەکی بۆ دەتاشێت ڕاست بێت یان درۆ، زانست ناتوانێ هێرش بەرێتە سەر نادیار (غیب)، چونکە خۆی تا هەردوو گوێی لەناو نادیاردا چەقیوە.

بۆ ئێمە باشتر ئەوەیە کە باوەڕمان هەبێت بە نادیار، بە خوای بەرزو گەورە، ئەو خوایەی کە جێگەی دەستەکانی لە هەموو چاوتروکانێکدا لە هەموو لێدانی دڵدا و لە هەموو بیرکردنەوەیەکدا دیارە، ئەمە باشترە بۆمان تا ڕۆچوون لە ئارەزووی خۆماندا.

---

[44] ئەمەم بە لاوە راست نییەو وابەزانم کە هەر شتەکان پیشانی ئادەم دراوە، چونکە زۆرجار (اسم) لە باتی (مسميات) لە دواندنی عەرەبیدا بەکاردێت.

- جەجاڵ :

ئایینەکان بۆمان دەگێڕنەوە[٤٥]، کە:لە ڕۆژانی دواییدا پیاوێك پەیدا دەبێت و خاوەنی زۆر شتی سەرسوڕهێنەر و پەرجوو (معجزە) دەبێ، خەڵکی لە ڕێگا لا دەدات، لە هەموو سەرزەمیندا وادەزانن ئەم پیاوە خوایە.

گێڕانەوەکان وا باس دەکەن کە ئەم پیاوە یەك چاوی هەیە، خاوەنی هێزێکی وایە هەرچی لەسەر زەوی بکرێ بەو تاکە چاوەی چاوی لێ دەبێت و گوێی لە هەموو چپەیەك دەبێت لە دوورترین شوێن بکرێت. باران دەبارێنێت و خەزنەی شاراوەی ژێر زەوی دەدۆزێتەوە، نەخۆش چاك دەکاتەوە، زیندوو دەکوژێت، ڕۆیشتنی وەکو تیژی ڕەشەبا وایە.

هەرکەس بیبینێ لە خشتە دەبرێ و لاڕێ دەبێ و سوژدەی بۆ دەبات، وا دەزانێ خوایە.

بەڵام موسڵمانەکان بە ڕاستی دەیناسن و ناتوانێ بیانخەڵەتێنێ، چونکە شێوەی خوانەناسی لە نێو چاوانیدا بە ئاشکرا دیارە.

---

[٤٥] ئەمە لە فەرموودەکانی پێغەمبەرە و ڕاستە، بەڵام نەك بە شێوەیەك، چونکە دکتۆر زۆری لە کتێبەکانی ئیسرائیلەوە وەرگرتووە.

ناوی (مسیح الدجال)ەو یەكێكە لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی جیهان و نزیكی هاتنی ڕۆژی لێپرسینەوە (وەكو لە كتێبە ئاسمانییەكاندا هاتووە).

نووسەری پۆڵۆنی[٤٦] (لیۆپۆڵدڤایس)[٤٧] دەڵێ: دەجال سەری هەڵداوەو پەیدا بووە.

هەروەكو ئەو دەڵێ: ئەم دەجالە یەك چاوە، بریتییە لە پێشكەوتنی ماددی و هێزی ماددییە، كە زۆرترین گەلان دەیپەرستن.

بەڵی ڕاستە دەجال شارستانیەتی چەرخی ئەتۆمە، كە بە چاوێكی كوێر و قاچێكی لارەوە و بە یەك لای ژیاندا دەڕوانێت و یەك لای ژیان دەبینێ ئەویش لای ماددییە و بەس، ئیتر چاوی دووهەمی كە چاوی دڵەو گیانی ژیانە، كوێرە، ئەمە هێزێكی بێ خۆشەویستی و زانستی بێ ئایینە و تەكنەلۆژیای بێ ڕەوشتە.

هەر بە ڕاستی ئەم جەجاڵە توانی لە ڕێگای زانستەوە هەرچی بكرێ لە ڕوی زەوی، بەڵكو لەسەر (مانگ)یش بە هۆی بێ تەلەوە

---

[٤٦] پۆڵۆنیا: كۆمارێكە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دانیشتوانی (٣٠) ملیۆن كەسن و پایتەختەكەی (ڤرسوڤیا)یە.

[٤٧] لیوبوڵدڤایس: زانایەكی زۆر بەرزی پۆڵۆنییە، لەم دواییەدا موسڵمان بوو، خۆی ناو ناوە (محمد أسد)، ماوەیەكی زۆر لە مەككەی پیرۆز ماوەتەوە، خاوەنی كتێبی (الاسلام علی مفترق الطرق)ە.

بیبیستێ و هەموو شتێك بە هۆی تەلەفزیۆنەوە ببینێ، ئێستا بە هۆی چەند هۆیەكی پیشەسازییەوە باران دەبارێنێ، هەزاران زەوی دێم بە بەراو دەكات، نەخۆش چاك دەكاتەوە، دڵی مردوان دەخاتە دڵی زیندووەوە، دەفڕێت بەسەر زەویدا بە هۆی فڕۆكەو ڕۆكێتەوە، مردن بڵاو دەكاتەوە بە هۆی ناپاڵم و ئەتۆمەوە، هەموو گەنجینەكانی نەوت و كانزا دەدۆزێتەوە.

هەموو خەڵكی لە ڕێگە لادا بۆ لای خۆی و دەستیانكرد بە پەرستنی.

ئێمەش كە سەیری ئەم پێشكەوتنە زانستیەی خۆرئاوامان كرد، باوەڕمان بە خۆمان نەماو زۆر بە سووكی سەیری نەریت و ئایینەكەی خۆمانمان كرد.

وامان دەزانی ئایینەكەمان دوای خستووین، بۆیە دەبێ زۆر زوو خۆمانی لێ ڕزگار بكەین، تاكو بگەینە كاروانی پێشكەوتووەكان، تاكو بگەینە كەنشتەی تازە، بۆ پەرستنی ئەو خوا تازەیەی داهاتووەو ناوی هێزی ماددەیە.

هەر لە دوورەوە دەستمان كرد بە كڕنووش بردن بۆی، نەمانزانی ئامێر (آلة) كامەیەو ئامانج (هدف، غاية) كامەیە، هێزی ماددەمان كرد بە ئامانج، نەمانزانی ئەمانە ئامێرن بۆ خۆشی ژیان، نەك ئامانجن بۆ پەرستن!!

شەمەندەفەر هۆیەکە.

تەلەگراف هۆیەکە.

وزەی ئەتۆم هۆیەکە.

ئەمانە هەموو ئەو هۆیانەن بۆ خزمەتکردن و دروستکردنی ژیانێکی خۆشتر بۆ ئادەمیزاد فەراهەم هێنراوە، تاکو کەمتر ئیش بکات و زیاتر بتوانێ بیر بکاتەوە زیاتر خۆی بناسێت.

بەڵام لە جیاتی ئەوەی ئەم هۆیانە کارگوزاری ئێمە بکەن، کەچی ئێمە بووین بە خزمەتکاریان، تێدەکۆشین، هەوڵ دەدەین، شەو دەدەینە دەم ڕۆژ و ڕۆژ دەدەینە دەم شەو هەتا ببینە خاوەنی ئۆتۆمبیل و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، کە بوینە خاوەنی ئەمانە زیاتر هەوڵ دەدەین بێوچان تا ببینە خاوەنی باڵەخانەیەکی چەند نهۆمی پڕ باخچە لە دواییدا بۆ دروستکردنی خانوو و دوکان بۆدانی بە کرێ، ئیتر بێ ئەوەی بیخۆین هەتا زیاترمان دەست بکەوێت و زیاترمان هەبێت زیاتر هەوڵ دەدەین و ژیان لە خۆمان تاڵ دەکەین، بەشێوەیەك تێدەکۆشین وەکو مردن هەر نەبێت هەتا ئەگەر دەست بدات هەوڵ دەدەین بۆ بونی فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ گەشت .

ئەمە نەك تەنیا تاك (فرد) هەوڵ دەدات، بەڵکو وەك ئێمە هەوڵ دەدەین بۆ پاشەکەوتی خواردەمەنی و جل و بەرگ، هەروەها

دەوڵەتەکانیش هەوڵ دەدەن بۆ کڕینی چەك و فڕۆکەی جەنگی و.... هتد، تاکو یەکتری قەلاچۆ بکەن و دیسان سەرلەنوێ پاشەکەوتی چەك و سامانی تر بکەن.

بەڕاستی جیهان وەکو شانۆیەك وایە کە هونەرمەندەکانی هەموو شێت بن و هەموویان بۆ یەك لای شانۆکە بە شێتانە ڕابکەن، بەرەو هێزی ماددیی.

مەسیحی دەجال کە یەك چاوی کوێرە، پەرستراوی ئەم ڕۆژگارەیە.

(هیچ خوایەك نییە ماددە نەبێ = لا اله الا المادة).

ئەمەیە نوێژی ڕۆژانەمان.

باوەڕ بە خوا نەماو ون بوو.

لەگەڵ شاردنەوەی باوەڕ بە خودا ئاسایش و ژیانی بە ئارام نەما.

جیهان بووە بە بێشەیەك وەکو دڕندە بە ددان و نینۆك بەربونەتە یەکتری، ململانێی چینایەتی، ململانێی نەتەوایەتی، ململانێی بیروباوەڕ، جیهانێکی پڕ لە ترس و کوشتن و هەزاران جۆرە چەتەیی.

هیچ کەس لە ئاسمان نییە چاودێری ئەم جیهانە بکات و بیپارێزێت، ئا بەم جۆرە بوین بە بەندەی (جەجاڵە کوێرێك کە

ناوی ماددەیە)، لە ئەنجامدا ئەو مرۆڤە قوڕبەسەرە بووە بە ماسی ناو گۆمێكی پڕ لە ترس و پەژارە، گەنجەكان بە مەستی لە شەقامەكانی لەندەن و پاریسدا كەوتوون، خۆكوشتن و شێت بون لە ولاتە دەوڵەمەندە ساماندارەكاندا وەكو نەرویج و ئەمریكا گەیشتووەتە سەر لوتكەی بەرزی.

ئەو مرۆڤە ترساوەی كە هەموو دڵنیاییەكی لە دەست دەرچوو، هەوڵ دەدات بە هۆی پیشەسازی تەكنەلۆژییەوە هێمنی و ئاسایش بۆ ژیانی دروست بكات، چاوێكی كارەبایی لەسەر دەرگای حەوشەكەیدا دابنێت بۆ دەرخستنی دزو زەنگێك بۆ عەمارەكەی دابنێت و هەموو مانگێك وێنەیەكی دڵ بە تیشك (اشعة) بگرێت بۆ ئەوەی بزانێ كەی تووشی دڵ وەستان (السكتة القلبية) دەبێت؟!!

دەبێ باخەڵی بە هەزاران جۆرە حەب و دەرزی ڤیتامینەكانی تێدا بێت، دەبێ ئامێرێك هەبێ بۆ بەهێزكردنی ماسولكەكانی، سەرەڕای ئەمانەو هەزاران پەنابردن بۆ ماددە ئەمجا هەر لەوپەڕی ترس و ناخۆشیدا دەژی، هەتا زیاتر پشت ئەستوور بێ بە ماددەو هێزی ماددە، زیاتر بە ترس و بێ ئارام دەبێت.

ئەم مرۆڤە ون بووە، هەموو تەمەنی بە خۆڕایی بەسەربرد، هەر لە پێشەوە نەزان بوو، كە وای زانی ئەم جیهانە بێ خوایەو

وادەزانێ بە بێ یاسا هێنراوەتە دنیا و کەس نییە پارێزگاری بکات و لێی بپرسێتەوە.

بۆ جارێکی تر هەڵەی کرد کە بوو بە بەندەی ماددەو وای زانی ماددە سەرچاوگەی بەختیارییەتی و بە هەموو ئامانجی ژیانی داناو لە جێی خوای دانا و وایزانی هێمای دڵنەوایی و ئارامی پێدەبەخشێ و ماددە ناهێڵێ بمرێ و لە کوشتنی دەپارێزێ.

کەچی هەر ماددە بوو کرا بە هەزاران جۆرە چەك بۆ کوشتنی مرۆڤ.

جارێك هەڵەی کرد، کە وایزانی کیمیا سروشتگەری و کارەبا زانستن و ئایین تەڵەکەو دەستبڕینە.

ئەگەر نەختێك بیربکاتەوە بۆی دەردەکەوێت، کە کیمیاو سروشتگەری و کارەبا زانستی وردەکارییە (جزئیات) و باسی وردە و چەندایەتی و چۆنیەتی دەکات، بەڵام ئایین زانینی تەواوکاری (کلیات)ە، بەڵکو ئەوپەڕی زانستە، چونکە باسی سەرەتایی و دوایی هاتنی هەموو شتێك دەکات.

ئایین باسی مانای گشتی و مەتەڵی گشتی ژیان دەکات.

کیمیاو بەشەکانی تری زانست، زانینی سەرەتایی بچوکن، بەڵام ئایین دوا پلەی زانینە گەورەکانە، کە گشت زانستەکان لە

خۆی دەگرێ، کەواتە هیچ کاتێك ئایین دژی زانست نییە، چونکە دوا پلەی زانست یەکەم قۆناغی ئایینە.

ئایین پێویستە، چونکە ئەو ڕەنگی خانوی ژیانمان بۆ دەڕێژێت، وەکو ئەوەی چۆن بخوێنین و چۆن لە چوارچێوەی ژیاندا بەکاری بهێنین.

ئایین ویژدان لە مرۆڤدا دروست دەکات و ویژدان دەزانێ هێزی ئەتۆم چۆن و لە کوێدا تاقی دەکاتەوە ؟ ناهێڵێ ماڵی بێ تاوانی پێ کاول بکەین.

ویژدان وامان لێ دەکات کارەبا بۆ ڕوناکی بەکاربهێنین، نەك بۆ کوشتن و مراندن.

ئایین پێمان دەڵێ: زانست (هەموو زانستێك) هۆیەکە، نەك ئامانج وەکو پێشکەوتنی ماددەی هۆیەکە نەك ئامانج، کەلوپەلی ماددی هۆیەکە.

ماددە وەکو ئێمە دروستکراوە نەك خوا بێ، ماددە ناتوانێ بەختیاری و کامەرانیمان بداتێ، سروشتی ماددە ئەوەیە کە شیبونەوەو تێکچون و گۆڕانی بەسەردا دێت، وەك ئەم گەردونە ناتەواوە، ناکرێ ماددە بکرێتە پاڵپشت و هێزی ڕاستیش پێك ناهێنێ.

پێشکەوتنی ماددی پێویستە، بەڵام هۆیەکی مرۆڤی خاوەن شارستانییەتەو زیاتر نا، ناشبێ بکرێتە مەبەست.

دیسان ئایین دژی پێشکەوتنی ماددی نییە، بەڵکو هانیشی لەسەر دەدات، بەڵام جێگەی خۆی و شوێنی شیاوی خۆی دەداتێ کە هۆیەکە نەك ئامانج.

نەویستنی پێشکەوتنی ماددی و زانستی تازە کارێکی خراپە، وەکو پەرستنەکەی بەدە، چونکە ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی دواکەوتنی وڵاتەکەمان.

بەڵام بۆ نەگبەتی گەلەکەمان لەناو ئێمەدا تەنیا یەکێکمان هەیە.

هەمانە زانستی ناوێت و تەنیا ئایین و قورئانی بێ زانستی گرتۆتە باوەش.

یان ئایینی ناوێت و دەستیکردوەو بە پەرستنی زانست و هۆیەکانی ماددە.

ئەمانە هەردوکیان لە ناوچەکەدا، هۆی نەگبەتی ژیار (حضار)ین.

هەردوکیان لە مانای ڕاستەقینەی ئایین و مانای ڕاستەقینەی زانست نەگەیشتوون.

ئایین، بەتایبەتی ئاینی ئیسلام فێربونی زانست بە پێویست دادەنێ، یەکەم وشە کە لە قورئاندا هاتە خوارەوە وشەی بخوێنە (إقرا) بوو.

پێشەوای ئیسلام دەفەرموێت: (من مات مهاجراً في سبيل العلم فقد مات شهيداً)[48]. واتە: ئەوەی بروات بۆ خوێندن و لە ڕێگای خوێندندا بمرێت شەهیدە.

هەروەها فەرموویەتی: (العلماء ورثة الأنبياء). واتە: زاناکان جێگەداری پێغەمبەرەکانن.

هەروەها (علينا أن نطلب العلم ولو بالصين)[49]. واتە: ئەرکە لەسەر پیاو و ژنی موسڵمان بڕۆن بۆ خوێندن با لە وڵاتی چینیش بێت.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە ڕێگای ژیرییەوە گفتوگۆ لەگەڵ ئادەمیزاد دەکات، زانست و پێشکەوتنی زانستی ماددی شوێنی تایبەتی و پایەی بەرزیان لە ئایینی ئێمەدا هەیە.

بەڵام هەموو کاتێک هۆی بەختیارییەو ئامرازێکە نەک مەبەست.

---

[48] لە کتێبەکانی بوخاری و موسلیم و ترمزی و نەسائی و ئەبوداود و ئیبنوماجە و ئەحمەد و مالیك و دارەمی سەبارەت بەم فەرمودەیە گەڕاین، بەڵام ئەم فەرمودەیەمان نەدۆزییەوەو نەبوو. (دەستەی نووسینگەی تەفسیر).

[49] ئەم فەرمودەیە لاوازە (ضعيف)ە.

ئەمەیە شوێنی ڕاستی خۆی بۆ زانستو ماددە.

ماددە (وەکو باسمان کرد) ئاسایشو کامەرانی و خۆشگوزەرانی نادات بە مرۆڤ، بەڵکو ئەمە ڕێگەیەکە بۆ ژیانی خۆش و باش گوزەرانی، بەڵام دڵەڕاوکێ و داڕوخانی گیانی هەردەمێنێ و لاناچێ، با خاوەنی هەزاران ئامێری وەکو تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و تۆمارکەر و فڕۆکە و پارەو سامان بێت.

هەتا مرۆڤ ئەو مادانە بە خوا بزانێت و بیانپەرستێت و ڕاکات بە شوێنیاندا دڵەڕاوکێو ترس و لەرزی زیاتری دەبێت و دڵی پشوو نادات.

گیان ئارام ناگرێت تەنیا بەیەك چارەسەر نەبێت کە ئەویش ئەوەی بڕوات هەبێ کە خوایەك هەیە ئەم گەردونەی وەدی هێناوە، ئەم خوایەش زۆر دادگەرە و پاشەڕۆژمان بۆ لای ئەوەو سزامان بە خۆڕایی نادات.

بونی ئێمە ڕاستییە، نەکراوین بۆ ئەوەی ببین بە خۆڵ، بەڵکو دەبێ پاشەڕۆژێکی نەبڕاوەی پڕ لە کامەرانی بێ ترسمان هەبێت.

ئەم باوەڕی ئایینە دەتوانێ ڕێزی مرۆڤایەتی مرۆڤ بداتەوە، نەك سینەماو باڕو تیاترۆ، نەك تەلەفزیۆن و ڕیکۆرد، نەك هیچ ئامێرێکی تر.

پاش باوەڕهێنان بەم جۆرە، پشوو دەکەوێتە دڵو مرۆڤ دەست دەکات بە کردنەوەی خانوی باوەڕو خۆی بۆی دەردەکەوێت کە لە مردن بەدەسەڵاتترە، چونکە پاش مردنیش هەر هەیە.

پاش باوەڕهێنان بەم باوەڕە، گەورەترین قەڵا دەشکێنێ، چونکە قەڵای باوەڕ بەهێزترە لە قەڵای پۆڵایین، ئەو قەڵایە بە هیچ ناپاڵمێك ناڕوخێت و بەسەر مردنیشدا باز دەدات.

بەم باوەڕە مرۆڤ هەست دەکات ناسنامەکەی بۆ گەڕاندوەتەوە و بە ڕاستی ئەمە خۆیەتی.

هەروا بە ناسینی خوای تاقانە، هەست بە خۆی دەکات و خۆی و شوێنو پایەی خۆی دەناسێ.

ئەوەی کە ئەم هەستە دەرونییە تاقی بکاتەوە دەزانێ کە تاقە ڕێگەی ڕۆشنکردنەوەی ناو دڵ هەر ئەم ڕێگەیەیە، نەك سەرلێشێواوی، نەك دڵخۆشی دانەوەی نەخۆشی، ئەمە ڕاستییە، ئەمە هەڵسانە لە خەو.

ئێمە کاتێ بە وردی سەیری ژیانی یەکێکی دژی ئەم باوەڕە بدەین ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە هەر لە هەڵسوکەوتی یەکێك لە بەندەکانی (دەجال) خوای ئەم سەدەیەو خاوەنی مێشکی ئەلیکترۆنی.

ئەمە تێوەشاندنە بە نینۆك و چڕنوك، ئەمە خۆگێلکردن و خۆ سەرخۆش کردنە بە ئارەق، کە ڕۆژ بە ڕۆژ و هەنگاو بە هەنگاو بەرەو جەنگێکی جیهانی سێهەممان دەبات.

جا تۆ بیت و ویژدانت ئەم دوو گرۆیە کامیان ڕاستن ؟

ئەو زۆرەی کە بەربونەتە یەکتری بە نینۆك و چڕنوکی پۆلایین ؟

یان ئەم کەمەی کە بە دڵێکی ئاسودەیی و کامەرانی ڕویان کردۆتە تاکە خواکەی خۆیان و بە ژیانێکی دڵنیایی دەژین ؟

ئایین ناڵێ مەژین، عەقڵیش ڕەت ناکاتەوە.

بەڵکو ئیسلامی پیرۆز لە ناوجەرگەی خۆشەویستی ژیانەوە هەڵقوڵاوەو چاودێری ژیان زۆر بە چاکی دەکاتو هەموو کاتێك ڕێزی هۆش و هۆشمەندانی گرتووەو داوای کردووە خەریکی زانست بن، ئایین ناڵێ گیان بکوژە بۆ لەش، نایشڵێ لەش بکوژە بۆ گیان، ناڵێ خۆت لە پیاوەتی بخە و مەچۆرە لای ژن، بەڵکو بە یاسا، لە چوارچێوەیەکی مرۆڤایەتیدا، نەك گاگەلی.

دیسان ئایین ناڵێ کۆمەڵ و ماڵ و مناڵ بەجێ بهێڵەو خەڵوە بکێشەو هەر خەریکی خواپەرستی بەو خۆت بشارەوە لە کارکردن، بەڵام دەڵێ چەند ئەرکێکی کەمت بەرامبەر خواو ئایینەکەت بەسەرەوەیە بەجێی بهێنە.

سامانی گیانی دەبێ بەرامبەر بێ . بەڵكو گیان دەبێ هاوبەش بێ . لەگەڵ ئیشی دەست و كۆششی قاچ و هەموو پارچەكانی تری لەش بۆ سودی كۆمەڵ.

نوێژی موسڵمانەكان، نیشانەیە بۆ ئەم یەكێتییە لە ئێمەدا هەیە . یەكێتی گیان و لەش . گیان لارەملەو بێ نەوایە، زمان دەپارێتەوە، لاشە كڕنوش دەبات.

خولاندنەوە بە دەوری ماڵی خوادا (طواف كعبة) نیشانەی ئەم یەكێتییەی لاشەو گیانە.

ئا بەم جۆرە ئایینی پیرۆزی ئیسلام یەكێتی ڕاستەقینە لە نێوان گیان و لاشەدا دروست دەكات و ئەو دژایەتییە كۆنەی لە نێوان ژیریی و شەهوەتدا هەیە پێشێلی دەكات و شتێكی تازە دروست دەكات كە ئەویش شەهوەتێكی عاقڵ.

وەكو یەكێتی دەبەسترێ لە نێو ئاشكراو نادیاردا، ئیتر ناگەڕێتەوە سەر تەڵەكەبازی و گەڕەكەی جاران (دڵ دژی هۆش و هۆش دژی دڵ، وتن دژی كردن و كردن دژی وتن).

لە جێی ئەو مرۆڤە پەرپوتە مرۆڤێكی تازەی یەك دڵ و زمان و یەك وتە و كردەوە دروست دەبێت.

بە یەکێتی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا، یەکێتی لەگەڵ خۆیدا دروست دەکات و بە یەکەم هەنگاوی بۆ ڕوناکی دەچێتە سەر ڕێگای ڕاست.

ئیسلام ئا بەم جۆرە دەگەڕێت بۆ یەکتاپەرستی (التوحید) و قورئان ئەمە دوپات دەکاتەوە لە هەموو پیتێکیدا، لە هەموو وشەیەکیدا، لە هەموو ئایەتێکیدا، دوپاتی دەکاتەوە بەشێوەی چیرۆك، بەشێوەی نموونە، بەشێوەی ئامۆژگاری.

ئیسلام بۆ ئەم چەرخی ماددەیە دەرگای ڕزگاری دەخاتە سەرپشت، هەر ئیسلامە دەتوانێ چارەسەری تەواوی بدۆزێتەوە، هەر ئیسلام دەتوانێ چارەیان بکات بێ ئەوەی لە سامانە ماددییەکەیان کەم بکاتەوە، بەڵکو لەگەڵ چارەسەرکردنیشیدا زیاتری دەکات.

ئیسلام داوای شتێکی زۆر گران ناکات، بەڵکو دەڵێ: (با برایەتی هەبێت لە نێوان گیان و ماددەدا) تاکو شارستانیەتی هێزو نەرمی پەیدا ببێت، تاکو هێزی مادده نەپەرستێت، بەڵکو مادده ببێ بە ئامێری دەستی دڵی بە بەزەیی.

ئابەم جۆرە دەجال مردار دەبێتەوەو دەوڵەتێکی مرۆڤایەتی ڕاستەقینە پێکدێت.

لە وەڵامی پرسیاری ئەوانەی کە دەڵێن خوا بێ پرس ئێمەی دروستکرد و سزامان دەدات، بۆچی دروستی کردووین ؟

دەڵێین: قورئان بە چەند ئایەتێك وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: (خوا کە ئادەمیزادی دروستکرد و ناردیە سەر زەوی (بەوپەڕی ڕێزەوە)، تاکو دروستکراوەکان خوا بناسێ و خۆی لە جێی بناسێ و شوێنی گەورەیی خوا بزانێت، بەم زانینە دەبێتە جێگای دڵنەرمی و بەزەیی خواو بەخششمان لە لایەن خواوە.

سزامان دەدات بۆ ئاگادارکردنەوەمان لە بێهۆشی تاکو ببێتە جێی بەزەیی خۆی.

بە خۆشەویستی دروستیکردین.

بۆ خۆشەویستی بووین.

بۆ خۆشەویستی سزامان دەدات.

دەسەڵات و گەورەیی هەر بۆ تۆیە لە زەوی و ئاسمانەکاندا ئەی خوای بەخشندەی میهرەبان.

## ـ هەڵسەنگاندن :

به پێنووسی شێخ عەبدولعەزیز پارەزانی

برای بەڕێزم کاك (مەلا موحەممەد مەلا سالح شارەزووری) پەڕاوی (گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ)ی بۆ ناردم، بۆ ئەوەی بیخوێنمەوەو لەبارەی وەرگێڕان و شێوەکەیەوە بیدەمە بەر ڕۆشنایی و ئەگەر شتێکم تێدا بەدی کرد چارەسەرێکی بۆ دابنێم.

کاتی کە خوێندمەوە ناوەڕۆکی پەڕاوەکە تینێکی زۆری کردە سەر دڵم و گەلێك شادمانی کردم.

بەڵێ، ئادەمیی جێگای هەڵەو لە ڕێ لادانە، یان جێگای ئەوەیە دودڵی و گومانی تێدا پەیدا ببێت، ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەر یان شورەیی نییە، بەڵکو شورەیی و نەنگی لەوەدایە کە ئادەمیی گەیشتە هەق و ڕاستی وازی لێبێنێ و پێی عەیب و عار بێت لەسەر باری پێشووی بگۆڕێت!!

بەڵێ، (دکتۆر مصطفی) یەکەم کەس نەبووە بکەوێتە شێوو هەڵەی هەزار بە هەزاری گومان و دودڵییەوە، بەڵکو لە پێش ئەوەوە گەلێك پیاوی گەورە هەبون وەکو ئەویان بەسەرهاتووە، پاشان کە دەرگایان بۆ کراوەتەوە سەریان تەقیوە بە هەقەوە باوەشیان پیاکردوە و بۆ هەتا هەتایی وازیان لێ نەهێناوە،

لەوانە . وەکو قورئان دەیگەیەنێت ئیبراهیمی خەلیل درودی خوای لەسەر بێت لە ئەستێرەوە چوو بۆ مانگ و دوایی بۆ هەتاو و ئینجا گەیشتە ئەوە کە خوا ئەو تاك و تەنیا گەورەو بەدەستەلاتەیە کە ئەمانەو ئاسمان و زەوی و هەموو بونەوەری دروستکردووە، یان فەیلەسوفی ئیسلام ئیمامی غەزالی (خوا لێی خۆش بێت) لە گومانەوە گەیشتە هەق و ڕاستی و وەکو لە پەڕاوی (المنقذ من الضلال)دا خۆی باسی دەکات، یان وەکو (کانت) فەیلەسوفی ئەڵمانی کە لە گومانەوە گەیشتە باوەڕ، یا... یا.... یا....

دکتۆر مەحمودیش یەکێکە لە پیاوە گەورە بەڕێزانەی کە بە شوێنکەوتن قایل نەبون و خۆیان هەوڵیان داوە ڕاستییان دۆزیوەتەوە، ئەگەرچی لەو ڕێگەیەشدا لە گەلێك زەلکاو و تۆز و خۆڵدا بەگیر هاتووە.

بە هەزاران سوپاس و درود بۆ ئەو گیانە خاوێنەی کەوا کۆڵی نەداوە تا ڕێگای ڕاست و ڕەوانی دیوەتەوەو ئێستا وەکو شارەزایەکی دڵسۆز پەنجە بۆ هەموو خاڵەکانی ڕادەکێشێت و لە هەموو هەنگاوێکدا نیشانکردمان بۆ دادەنێت.

بە ڕاستیی نوسینەکەی گەلێك بە کەڵکە، چونکە نوسینی شارەزایەکی خاوەن بەهرەی لێهاتووە و هەموو شتەکانی

تاقیکردوەتەوەو لە چاك گەیشتوەو بەشێوەیەکی دکتۆرانە باسی کردون و شییکردونەتەوە.

خۆزگە خوێنەرە کوردەکانمان بە وردی ئەم پەڕاوەیان بخوێندایەتەوەو بە شوێنی ڕاستییدا بگەڕانایە و چاوپێچکی شوێنکەوت و لاساییان لەسەر چاویان لابدایەو ببونایە بە شاگرد، یان بە هاوڕێی دکتۆر (مصطفی محمود)ی بەختیار.

سلێمانی

٢٤/ذو القعدة/ ١٣٩٤ك

٩/١٢/١٩٧٤ز

# ناوەڕۆک